له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

---

# زاراوەی کارگێڕی

دانان و لێدوانی

## ئەنجومەنی کۆڕ

پێشەکی و ڕێکخستنی

د. کەمال مەزهەر

---

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا ١٩٧٣ - ١٩٧٤

كۆڕی زانیاری کورد

# زاراوەی کارگێڕی

---

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا - ١٩٧٣

# بەشی یەکەم

هەڵبژاردنو دانـانو داتاشـینی زاراو یەکێکە لەو ئــەرکە گرنگانەی کۆڕ گرتوونیەتە ئەستۆی خۆی . دەمێکە ئەنجومەنی کۆڕ بەشێکی زۆری کۆبونەوەکانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردوە ، بـە تایبەتی بۆ گەلاڵە کردنی زاراوی کارگێڕی . بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکە ئەنجومەنی کۆڕ هــەوڵی داوە کەڵك لە بەرهەمی زاناو شـارەزایانی کوردو بێگانەو تاقی کردنەوەی گەلانی تر لەم مەیدانەدا وەربگرێت ، وە چەند ڕێبازێکی زانستی دیار کردوە بـۆ ئـەوەی لە سنوری توانادا بتوانێت بەرهەمێکی کامڵ بخاتـە بەردەســـت ، چونکە ، هەروەك ئاشکرایە ، دانانی زاراو بە نیسبەت زمانی هەمو گەلێکی دواکەوتووەوە کارێکی ئاسانو کەم تەنگو چەڵەمە نییە .

بە بڕی ئەنجومەنی کۆڕ لە کاتی دانـانی زاراوەدا پێویـســـت بەوە ناکات سڵ لە هەمو وشەیەکی بێگانە بکەینەوە ، وە هیچ زمانێك نییە ، بە تایبەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا ، لە چوارچێوەی قالبێکی تەسکی تەنها خۆماڵیدا گەشە بکاتو بەرەوپێش بڕوات ؛ گەلێك نمــونەی زمانی پێشکەوتوی ئەوتۆ هەیە کە بە هەزارەها وشـــەی بێگانەیان

تێکەڵ بوە . جگە لەمە شوێنی کوردستانو مێژوَی چەند هەزار ساڵەی گەلی کورد کارێکی وەهایان کردوە ژمارەیەکی زۆر وشەی بێگانە ( بەتایبەتی عەرەبیو فارسیو تا رادەیەکیش تورکی ) تێکەڵی زمانەکەمان ببنو[1] بگەنە دوَرترینو کەلاترین قوژبنی کوردستانو تەنانەت جۆری دارشتنو شێوەی زۆربەی هەرە زۆریان بەجارێك گۆڕاوە بۆیەکا بە بیری ئەنجومەنی کۆڕو ژمارەیەکی زۆر لە زاناو شارەزایانی تر هیچ پێویست بە مراندنی ئەو جۆرە وشەو زاراوانە ناکات بە تایبەتی ئەگەر ئەوەش لەبیر نەکەین کە وا زمانی کوردی زمانێکی دەوڵەمەندو خاوێنە . لەبەر ئەوە ئەنجومەن هەوڵی گۆڕینیان بە وشەو زاراوی نەزاراوو قەبە بە کارێکی ناڕەوا دادەنێت . بەلام لە هەمان کاتدا ئەنجومەنی کۆڕ هەوڵدان بۆ پاك کردنەوەی زمانی کوردی لە وشەو زاراوی نەگونجاو لەگەڵیدا بە کارێکی پێویستو ئەرکێکی گرنگ دادەنێت ، بە تایبەتی لەو شوێنانەدا کە وشەو زاراوی کوردی پەتی بەرامبەریان هەیە یان لە ڕێگەیانەوە دەتوانرێت زاراوی نوێ دابنرێت[2] . لەبەر ئەمەو چەند هۆیەکی تر

---

(١) هەر بەو جۆرەش ، زۆر یا کەم ، وشەو زاراوی کوردی تێکەڵی زمانی گەلە دراوسێکانی کورد بوە .

(٢) بایەخو نرخی جێ بەجێ کردنی ئەم کارە تەنها لە سنوری زانستدا ناوەستێت ، بە تایبەتی ئەگەر بێتو بزانین بە داخەوە هێشتا زۆری وا هەن لە نەزانینەوە یا لە خۆ گێل کردنەوە کوردی بە زمانێکی هەژارو کەم توانا دادەنێن . تەنانەت ڕۆژنامەی تورکی « حاکمیەتی میللی » لە ژمارەی ڕۆژی ١٠ی ئابی ساڵی ١٩٣٠دا بە گاڵتە پێکردنەوە باسی ئەوەی کردبو کە گوایە « فەرهەنگی هەموو زمانی کوردی لە ٢٠٠ وشە تێپەڕ ناکات » . پان ـ ئێرانستەکانیش زمانی کوردی بە زارێکی « لهجە » فارسی دادەنێن .

ئەنجومەنی کۆڕ زیندو کردنەوەی وشەی کۆنی کوردی و چەسپاندن و بلاوکردنەوەی هەمو وشەو زاراوێکی ناوچەیی کوردی پەتی بە کارێکی یەکجار گرنگ و پێویست دادەنێت و دیارە موتوربە کردنی کرمانجی و سۆرانی بە وشەو زاراوی یەکتر تا رادەیەکی دیار ئەم ئەرکە ئاسان دەکات . فراوان کردنی مەودای بەکار هێنانی (إشتقاق) و (قیاس)یش ، بە تایبەتی لە سۆرانیدا ، کارێکی زۆر پێویستە بۆ دارشتنی ژمارەیەکی زۆر زاراوی نوێی کوردی پەتی .

ئەنجومەنی کۆڕ لە کاتی دانان و هەلبژاردنی زاراوەکانیدا هەوڵی داوە لە هەمو رۆیەکەوە کەلك لە بەرهەمی شاعیرە کۆنەکان و فۆلکلۆرو قسەی باوی ناو لادێ و ناوچە جیاوازەکانی کوردستان و فەرهەنگە کوردیەکان وەربگرێت .

هەرچەندە ئەنجومەن بە رادەی یەکەم بایەخی بە دانانی زاراوی کارگێڕی داوە ، بەلام لە هەمان کاتدا لەو زاراوانەی تریش کۆلیوەتەوە کە بەو بۆنەیەوە هاتونەتە پێشەوەو بە پێویستمان زانی بەسەر یەکەوە بلاویان بکەینەوە بە هیوای ئەوەی لە دوارۆژێکی نزیکدا جیایان بکەینەوەو جارێکی تر بەپێی باس بیانخەینەوە بەر چاو .

بێ گومان لەوانەیە بەشێك لەم زاراوە دانراوانە لە سەرەتادا (وەك گەلێك زمانی تر) بە گران یا سەیر بێنە بەر چاو ، بەلام وتنەوەو بەکار هێنانیان دەبنە هۆی چەسپ بون و بلاوبونەوەو مانیان . بەوێنە ئەمڕۆ لەوانەیە بە دەگمەن خوێندەواری وەها

هەڵبکەوێت بە وشەی (شــاگرد) لە بریتی (قوتابی) قایـل بێـت هەرچەندە ئەم وشەیە لە ناو باوو باپیرانماندا باو بووەو لە شــیعری شاعیرە کۆنەکانماندا هەیەو وشەیەکی کوردیی پەتییەو هـەر لەبەر ئـەم هۆیانەش بەکار هێنانی گەلێك رەواترە وەك لە بەکار هێنانی (قوتابی) کە لە (کُـتابي) عەرەبییـەوە وەرگـیراوە و (ك) ەکەی لە رێگـەی تورکیی جەغەتاییەوە بۆمان گـۆڕاوە بە (ق).

لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئەوەش بخەینـە بەر چــاو کە وا ئەنجومەنی کۆڕ بە دانانی زاراوی نوێی نایەوێت زاراوو وشـە بەکار هێنراوەکانی تر لە ناو بچێت وە ئەمە بە هەڵەیەکی گەورە دادەنێت. بەوێنە ئەنجومەن وشەی (بیانی) ی لە (بێـگانە) پێی جوانترە بۆیەکا بڵاوبوونەوەو بەکار هێنانی بە پێویست دەزانێت، بەڵام هەر بــەو رادەیەش پاراستنی (بێـگانە) وەك وشەیەکی فەرهەنگـیی و باو بــە پێویست دەزانێت لەبەر ئەوەی، هەر وەك ئاشکرایە، بوونی وشـەی جیاوازی یەك واتا بەخش بەڵـگەی دەوڵەمەندیی زمانە.

بە بـۆنەی بڵاو کـردنەوەی زاراوی (کـارگێڕیی) یــەوە زۆر بــە گەرمی داوا لە مامۆســتا کــوردە دڵسـۆزەکان دەکەین بە وردی سەرنجیان بدەنێو لییان بکۆڵنەوەو بیری خۆیانـمان لە ماوەی شــەش مانگدا پێی رابگەیێنن بۆ ئەوەی ئەنجومەنی کۆڕ بتوانێت بە شێوەیەکی باشتر دوا بڕیاری خۆی لە بارەیانەوە بداتو بە یەکجاری چەسپیان بکاتو بۆ دواجار بـڵاویان بکاتــەوە.

هیچ دوریش نییە گەلێك زاراو هەبن کە ئێمە هەستمان پێی نەکردبێو

له هه‌ندێك له‌م زاراوه پێشنیار كراوانه باشتر بن ، له‌به‌ر ئه‌وه تكا له هه‌مو برایه‌كی كوردی خوێنده‌وار ده‌كه‌ین ، به تایبه‌تی ئه‌و مامۆستایانه‌ی له ناوجه‌رگه‌ی لادێكاندا كار ده‌كه‌ن ، ده‌ستی یارمه‌تیان بۆ درێژ بكه‌ن و هه‌ر پێشنیارێكیان هه‌یه به زووترین كات پێشكه‌شمانی بكه‌ن .

# لیسته‌ی یه‌كه‌می زاراوی كارگێری

## ـ أ ـ

| زاراوی عه‌ره‌بی | زاراوی كوردی | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| ائتلاف | ته‌بایی | |
| إبداع | جوانكاری ، شیرینكاری* | |
| إبلاغ | راگه‌یاندن | بڕوانه : « بلاغ » . |
| ـ تبلیغ | راگه‌یاندن | بڕوانه : « تبلیغ » . |
| أتباع | ده‌ستوپێ | به‌كارهێنانی ( پێوه‌ند ) [ وه‌ك ئه‌وه‌ی ده‌ڵێن : ده‌ستوپێوه‌ند ] هه‌ڵه‌یه ، ( پێوه‌ند ) به‌و شته ده‌گوترێت كه وڵاغی بۆ ده‌به‌سترێته‌وه ؛ شێخ ره‌زا ( ده‌ستوپێ ) ی به‌كار هێناوه : == |

* به‌رامبه‌ر به هه‌ندێك وشه‌و زاراوی ئه‌م لیسته‌یه دوو واتا دانراوه كه له‌وانه‌یه هه‌ردووكیان زۆر باو بن و پارسه‌نگ كردنی یه‌كێكیان ئاسان نه‌بێت ؛ تكا له مامۆستاو شاره‌زایانی به‌ڕێز ده‌كه‌ین بیرو پێشنیاری خۆیانمان له‌م باره‌یه‌وه پێشكه‌ش بكه‌ن .

| | | |
|---|---|---|
| | | = خەی شاگردەکانی زۆتر ئەخوێم گەورە ، هەر باشە ئاخ لە دەس دەستوبێ |
| إتحـــاد | یەکـیەتی | |
| إتفـاق | رێك‌کەوتن ، پێکهاتن | |
| إتـلاف | لەناوبردن | |
| أثــاث | شـتومەك | دەشـتوانرێت « شـمەك » بـەکار بهێنرێت ، هـەر بەو جـۆرەش لە هەندێك ناوچەی کوردستان باوە ؛ بڕوانە : « بضاعة » . |
| آثــار | شوێنەوار | دەگوتـرێـت : ئـاغا مردو شوێنەوار .. |
| ـ الآثار القديمة | کۆنینە | وەك : « Antique » ی ئینگلیزیو فەرەنسی . |
| إثبـات | چەسپاندن | |
| إجازه | وچان | |
| ـ الاجازه المرضية | وچانی نەسـاغی | |
| ـ الاجـــازه الاعتيادية | وچانی ئاسایی | |
| ـ الاجازه الدراسية | وچانی خوێندن | |
| إجازة (رخصة عمل) | رێ دان | |
| اجـــترار | کاوێـــژ | |
| اجتـــماع | کۆبونەوە | |

| | | |
|---|---|---|
| أجر ( اجرة ) | کرێ | بڕوانە : « تحديد الاجر » . |
| اجرة الاعمال اليدوية | دەستکر | لە ( دەستکرێ ) وە داتاشراوە . |
| أجرة يومية | ڕۆژانە | |
| أجل | مەودا | |
| ـ الأجل الأخير | دوامەودا | |
| أجنبي | بیانی | وشەی ( بیانی ) لە بادینان باوەو لە ( بێگانە ) جوانترە ؛ ( بێگانە ) لە زمانی فارسیشدا بەکار دەهێنرێت ؛ کوردی سۆڤیێتیش ( بیانی ) بەکار دەهێنن ( بڕوانە : Q. Kurdo. Ferhenga Kurdî – Rùsî, Moskva, 1960, L. 91 . لەمەودوا : ... Q. Kurdo ) . |
| إحترام | ڕێز | |
| احتياط | یەدەك | دەنگی بیتی ( ك ) لەم وشەیەدا لە هەندێك ناوچە گۆڕدراوە بە ( گ ). |
| احتياطات | قایمەکاری | |
| إحراقية | سوتەمەنی | لە ( موکریان ) ئاوردو کە لە ئاگرو دۆکەڵ وەرگیراوە وە لە (جزیری) ئاردو بەکار دەهێنرێت . |
| إحصاء | ئەژمار | لە کرمانجیدا بەکار دەهێنرێت ، هەروەها لە ناو ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکانی کوردستاندا باوە . ( ئامار ) یش بەکار دەهێنرێت . |
| إحضار | ئامادەکردن | |

| | | |
|---|---|---|
| إختـراع | داهێنان | |
| إختصاصي | پسـپۆر | دەگوترێت : لە یاسادا پسپۆرە، پسپۆڕی نەخۆشی منداڵانە . . |
| إختلاف (في الرأي) | جیـاوازی | |
| إخراج ( تمثيل ) | دەرهێنان | |
| إخراج (گمرگی) | دەرهاویشتن | |
| إخطـار | راگەیاندن | بڕوانە : « إبلاغ » و « بلاغ » . |
| ـ الاخطار النهائی | دوارِاگەیاندن | بڕوانە : « إنذار » . |
| إخـلاص | دڵسـۆزی | |
| اخـلاق | رەوشت | |
| أداء | جێهێنان | |
| أداة | ئەمراز | لە زمانەوانی کوردیدا بە شێوەیەکی فراوان بەکار هێنراوە ؛ بڕوانە : « أدوات » . |
| إدارة | کارگێڕی | |
| ـ الأداره | بەشی کارگێڕی | |
| ـ الادارة المحلية | گێڕانی ناوخۆیی | |
| ـ مديـر | کارگێڕ | بڕوانە : « مدیر » . |
| ـ مديرية | کارگێڕی | بڕوانە : « مدیریة » . |
| أدب | وێـژە | شێخ محەمەدی مەردۆخ بەرامبەر ( وێژە ) « شعر » و بەرامبەر ( بوێژ ) « قائل » و « ناطق » و= |

| | | |
|---|---|---|
| | | = «متكلم» ی داناوه ( بڕوانه : «فرهنگ مردوخ» ، جلد دوم ، ل ۸٥۱ . لەمەو دوا : مەردۆخ ...) «ئەدەبی» کوردیش لە زووەوە بریتی بووە لە (شیعر) و ( فولکلۆر ) بۆیەکا فراوان کردنی مانای ( وێژە ) بە جۆرێك کە هەمو ( ئەدەب ) بگرێتەوە کارێکی ڕەوایە . |
| ـ أديب | وێژەوان | |
| إدخار | پاشەکەوت کردن ، گردەوەکۆیی . | |
| إدخال | داخۆن | ئەم وشەیە لە ناو گەلێك هۆزی کوردستاندا باوە ؛ دەگوترێت : داخۆن کرا ، داخۆن بۆ ... |
| ـ إدخال مخزني | داخۆن کردن | |
| أدوات ( للعمل ) | ئەمراز | دەگوترێت : ئەمرازی دارتاشی . |
| ـ الأدوات الاحتياطية | ئەمرازی یەدەك | |
| إذاعة | پەخشین | |
| إرتجالي | سەرپێیی | |
| إرتفاع (إرتفاع السطح ) | بەژن | بڕوانە : «حجم» ، «طول» ، «عرض» ، «قاعدة» ، «مركز» و «مساحة» . |
| إرث | میرات | |
| إرشاد | ڕابەری | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ مرشـد | رابەر | بڕوانە : « مرشد » ە . |
| إرهـاب | تۆقاندن | |
| اساس | بنـاغە | لە ( بن ئاخ )ەوە وەرگیراوە . |
| اساسی | بنەڕەتی ، بنچینەیی | |
| استـاذ | پرۆفیسۆر | وەك نازناو ؛ ( مامۆستا ) ش بە شێوەیەکی گشتی بەکار دەهێنرێت. |
| إســتثناء | دەرهاویشتن | |
| ـ باستثناء | جگە لە | |
| ـ إستثناءاً من | بەدەر | دەتوانین بڵێین : بەدەر لە بڕیاری رابوردوومان ... |
| إستخدام | خستنەکار | |
| إستخراج | دەرهێنان | |
| إستدر | وەرسوڕێ | بۆ وەرزش و سوپا . |
| إسـترح | پشــوودە | بۆ وەرزش و سوپا . لە زۆر ناوچەی کوردســتان ( وەك لە سلێمانی و موکریان ) دەگــوترێت : پشووبە ... ، پشوودە لەسەر وەزنی ریزبە ، وریابە ... |
| إستشارە | راوێژ | |
| ـ مستشار | راوێژکار | |
| ـ مستشیر | راوێژخواز | |
| ـ الهیئــة الاستشاریة | دەستەی راوێژ | |

| | | |
|---|---|---|
| إستعارة | خواستن | |
| ـ محل ( مكان ) الاستعاره | خواستنگه | واته جێگەی خواستن . |
| استعد | وریابه | بۆ وەرزشو سوبا . |
| استعراض | نواندن | |
| إستعلامات | پرسگه | واته جێگەی پرسین . |
| إستعمال | بەکار هێنان | |
| إستغناء | واز لێ‌هێنان | |
| إستفتاء | راوەرگرتن | |
| إستقطاعات | دابڕین | |
| إستلام | وەرگرتن | بڕوانە : « تسلم ». |
| إستمارة القبول | خوازنامه | واته داخوازی قبوڵ دەکات . |
| إستمارة النقل | گوازنامه | |
| إستنساخ | رۆنوس ، نوسینەوه | دەگوترێت : ئەو کتێبە رونوس بکە . . . |
| استهلاك | تێ‌بون | |
| ـ مواد مستهلكه | شڕه | |
| ـ مستهلَك | تێ‌چو | |
| ـ مستهلِك | تێ‌بەر | |

| | | |
|---|---|---|
| إستيراد | هاوردن | هاوردم ، دەهێرێ ، دەهێرم ... ؛ لە ئەردەلان ئەهێرێو ئەهێرم باوە ؛ مەردۆخیش هاوردنی بەکار هێناوە ( مەردۆخ ، بەرگی دوو ، ل ٨٦٤)، پێچەوانەکەی : « تصدیر » = دەرنان ، بڕوانە : « تصدیر » . |
| ـ مستوردە (أموال) | هاوردە | زوو دەگوترا : ئەم دەساڵە هاوردەی تەورێزە ... |
| إسطوانة | کۆڵەکە | Column. |
| اسعاف (الاسعاف الطبي) | فریاکەوتن | |
| ـ اسعافات اولیة | فریای بەرایی | |
| اسلوب | شێواز | |
| اشارة الی | نیشان بە | |
| اشتراك | بەشداری | |
| اشراف | سەرپەرشتی | |
| إصطبل | پیشتێر | لە لادێ بەکار دەهێنرێ ، لە « ئەحمەدی »دا بۆ هەمان واتا بەکار هێنراوە ( بڕوانە : شێخ مارفی نۆدەیی ، احمدی ، رواندز ، ١٣٤٥ ، ل ١١ . لەمەودوا : « ئەحمەدی » ) . |
| اصطفاف | ریزبوون | |
| ـ اصطف | ریزبە | بۆ وەرزش و سوپا .. |

| | | |
|---|---|---|
| اصطلاح (مصطلح) | زاراو | وشەیەکی کوردیی پەتییە . لە بادینان دەگوترێت « زاراڤ » . ( زاراو ) لە ( زار ) ەوە هاتوە [زار=دەم]. (زاراو) لە (زاراوە) رەسەن ترە ؛ لە کوردیدا گەلێک وشە بە (أ) و (و) کۆتاییان دێت . مامۆستایان جەلادەت و کامەران بەدرخان لە دەمێکەوە لە نوسینەکانی خۆیاندا (زاراو) یان بەکار هێناوە . |
| أصيل | رەسەن | |
| ـ غير أصيل | نارەسەن | هەرچەندە بووە بە جنێو بەڵام لە لادێدا واتای ئەسڵی خۆی پاراستوە ؛ لە لادێ دەڵێن : ئەم وڵاغە وڵاغێکی نارەسەنە ؛ دەتوانین بڵێین : لێکۆڵینەوەکەی لەبارەی مێژوی کوردستانەوە لێکۆڵینەوەیەکی نارەسەنە ... |
| اضافة الى | سەرەڕا | |
| اضافة على | سەرەڕا | |
| اضبارە | دۆسیە | |
| ـ الاضبارە الشخصية | دۆسیەی تەن | |
| اطاعة | گوێداری | |
| اطفاء (الحريق) | ئاگرکوژێنی | |
| اطلاع | ئاگاداری | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ للاطلاع | بۆ ئا ـاداری | |
| ـ إطلعت | ئاگادار بتوم | |
| إطلاق سراح | رەها کردن | دەڵێین : لەو بەندەم رەها کە |
| اعادة (كتاب رسمي) | ناردنەوە | |
| اعادة ( للوظيفة ) | گێڕانەوە | |
| اعاشــــه | بژێـو | ( بژێـو ) لە زۆر نـاوچـەی کوردستان بە مانای « قوت » باوە . |
| اعانــة | کۆمــەك | |
| اعتــذار | بوردن خوازی | دەتوانین بڵێین : بوردن خـوازی پێشکەش کرد .... |
| اعتراض | بەرپەرچ | دەگـوترێت : بەربەرچی کرد ، بەرچی بزمار ... |
| اعــــتراف (اعتراف بالدول) | زانین ، ناسین | دەگوترێـت : بە گـەورەی خۆمی ئەزانم .. دەڵێین : بە کیشوەری زانی ، یا : بەکیشـوەری ناســی . ( ناسین ) یا ( زانین ) لە ( دان پێدا نان ) کە ئێســتا بـەکار دەهێنرێت کورتترە ، جگە لەوەی (دان پێدا نان ) لە راستیدا بە مانای (اقرار) و ( اعتراف بالخطيئه ) دێت . |
| اعتراف ( بالذنب ) | پێ لێ نانـ | |
| اعتـماد ( اعتماد مالي ) | پشتیوانە | بڕوانە : « رصيد » . |

| | |
|---|---|
| اعتيـادی | ئاسایی |
| اعـداد | ئاماده کردن |
| ـ اعداد المعلمين | ئاماده کردنی فێرکار بڕوانه : « معلم » . |
| ـ الاعداديه | ئامادەیی |
| اعفاء ( عن مهمة ) | جەبدان |
| اعـلام | ئاگـاداری |
| ـ نعلمكم بان .. | ئـاگادارتـان دەکەین کە وا ... |
| اعلام الزوجيه | بەڵـگەی خێزانی بڕوانه : « بيان قيام الزوجية » . |
| اعـلان | ئاگایی ، جاڕ |
| اعمـال يدوية | کاری دەستی |
| ـ عمل اليد | کاری دەست |
| افشـاء | درکاندن |
| افـق | ئاسـۆ |
| ـ أفقـی | ئاسـۆیـی |
| اقتبـاس | لێ وەرگرتن |
| اقـتراح | پێشـنیـار |

| | | |
|---|---|---|
| اقتصاد | ئابوری | |
| الاقتصاد المنزلي | ماڵداری | |
| اقرار | دان پێدانان | |
| الاقلية | کەمینە | لە هەندێک ناوچەی کوردستان ( کەمینە ) بەکار دەهێنرێت ؛ نالی ( کەمینە ) ی لە شیعری خۆیدا بەکار هێناوە ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( بڕوانە گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژمارە ــ٤ــ ، ١٩٧٢ ، ل ١٥٩ . لەمەو دوا : « پەروەردەو زانست » ) ؛ پێچەوانەی ( کەمینە ) (زۆرینە) یە ، بڕوانە :«الاکثرية»؛ « کەمایەتی »کە ئێستا باوە مانای تەواوی « الاقلية » نادات جگە لەوەی بەمانای سوکی دێت . |
| أقمشة | کوتاڵ ( ف )* | |
| اکتتاب | باربو | دەگوترێت : باربویان بۆ کرد . |
| اکثرية | زۆربە ، زۆرترین | |
| الاکثرية | زۆرینە | لە هەندێك ناوچەی کوردستان بەکار دەهێنرێت ؛ پێچەوانەی ( زۆرینە ) ( کەمینە) یە ؛ بڕوانە : « الاقلية » . |
| اکرامية | بەخشیش ، ڕێزانە | |

* مەبەست لەوەیە کە ( وشەیەکی فەرهەنگی ) یە .

| | | |
|---|---|---|
| اكمال (في الدرس) | دواكەوتن * | |
| ـ مكمل | دواكەوتە | بڕوانە : « مكمل » . |
| ألبان | شیرمەنی ، سپیایی | |
| التحاق (بالوظيفة) | چوونە سەر كار | |
| إلحاق (الحاقاً بكتابنا) | دوا بەدوا | |
| الصاق (للتهمة) | تۆساندن | |
| الغاء (فسخ) | هەڵوەشاندنەوە | |
| الفات نظر | سەرنج ڕاكێشان | |
| آلة | ئامێر | |
| آلة الترشيح (في المختبر) | پاڵوێنە | لە زۆربەی گوندو لادێی كوردستان باوە ؛ دەگوترێت : ئەو شیرە بە پاڵوێنەكەدا بكە ... |
| الآلة الحاسبة | پێ‌ژمار | لە ( بۆ ژماردن ) ەوە وەرگیراوە . |
| آلي | ئامێرچی | |
| أمانة العاصمة | پاتەختەوانی | بڕوانە : « عاصمة » . |
| امتحان (اختبار) | ئەزموون | لە ناوچەی باڵەكو سوورچی‌و ناودەشت‌و گەلێك شوێنی تری كوردستان بەكار دەهێنرێت ، دەگوترێت : ماستی ئەزموون لە ماستی نەزموون باشترە . ئەزموون لەسەر= |

---

* ئەنجومەنی كۆڕ بایەخێكی زۆری داوە بە دانانی ئەو زاراوانەی بۆ فێرگەو ئامۆژگا بەرزەكان پێویستن .

= وەزنی ( فەرموون ) ؛ ئەزموون
کرام = « امتحان » کرام ،
ئەزمونیان = ( امتحان ) کرا ...
( تاقی کردنەوە ) دوو وشەیە
جگە لەوەی لە ( تحقیق ) ی
عەرەبییەوە وەرگیراوە .

- امتحان الاکمال — دوا ئەزموون

- امتحان نصف السنة — ئەزمونی نیوەی ساڵ

- الامتحان النهائی — ئەزمونی کۆتایی

- الامتحان الوزاري — ئەزمونی وەزاری

أمر — فەرمان

- أمر اداري — فەرمانی کارگێڕی — بڕوانە : « إدارة » .

- أمر رسمی — فەرمانی میری — بڕوانە : « رسمی » .

- أمر وزاری — فەرمانی وەزاری — بڕوانە : « وزیر » و « وزارة » .

آمر — فەرماندە

- آمر الحامية — سەرئۆردی — بڕوانە : « حامیة » .

- آمر الحضیره — سەردەستە — بڕوانە : « حضیرة » .

- آمر السریة — سەرلق — بڕوانە : « سریة » .

- آمر الفصیل — سەرپەل — بڕوانە : « فصیل » .

- آمر الفوج — سەرهەنگ

| | | |
|---|---|---|
| ـ آمر لواء | سەرتیپ | بڕوانە : « لواء » . |
| ـ آمر المقر | فەرماندەی بنکە | بڕوانە : « مقر عسکری » . |
| إملاء (قواعدالاملاء) | ڕێنوس | لە ناو خوێندەواردا باوە ؛ لە ( ڕێگەی نوسین ) ەوە وەرگیراوە. |
| أمن | ئاسایش | لە زۆرناوچەی کوردستاندا باوە ، دەگوترێت : ئەمن و ئاسایش . |
| ـ دائرة الامن | فەرمانگەی ئاسایش | |
| إمهال | ماوە پێدان | |
| أمة | نەتەوە | لە زۆر دەمێکەوە باوە . |
| أمي | نەخوێندەوار | |
| أمين السر | رازگر | بڕوانە : « کاتم السر » . |
| أمين الصندوق | خەزنەدار | هەر لە کۆنەوە وەهای پێ گوتراوە . |
| أمين العاصمة | پاتەختەوان | بڕوانە : « عاصمة » . |
| الامين العام | سکرتێری گشتی | بڕوانە : « السکرتیر العام » . |
| انتاج | بەرهەم | |
| انتخاب | هەڵبژاردن | |
| انتظار | چاوەنوارێ ، چاوەڕێی | لە بۆتان دەڵێن : چاونێڕی . |
| إنتقام | تۆڵە | |
| انتماء | هاتنە ریز | |

| | | |
|---|---|---|
| انتهاء الخدمة | بڕانەوەی خزمەت | بڕوانە : « خدمة » . |
| انـذار | گـەف | لە هەندێك ناوچەی سۆران باوە ؛ دەگوترێت : گەفم لێ مەکە ، واتـە مەمترسێنە . لە کاروباری کارگێڕیدا بە پێی پلە ئەم سزایانە هەن : «توبیخ» ـ سەرزەنشت ، «انذار» ـ گەف ، «تهدیـد» ـ هـەڕەشـە ، «اخطار» ـ راگەیاندن ، «الاخطار النهائي» ـ دوا راگەیاندن. |
| انسجام | گونجان | |
| آنسـة | خاتون | رەواشە بوترێت : خاتو ، وەك : خاتو ئایشـێ ، خاتو زیـن ... لە سۆران بە « مەمو زین » دەگوترێت: بەیـتی کاکە مەمو خاتو زیـن ، هەروەها بەیتی ( خاتو نەسـتیش ) هەیە ؛ لە فۆلکلۆری کوردیدا ئەم بەندە باوە :<br>گـلارە ترێ وە دەمتا ناچێ<br>ماجی خا فاتم لە دڵم دەرناچێ<br>(خا)لێرەدا کورت کراوەی(خاتو)ە؛ بڕوانە : « سیدة » . |
| انشـاء ( للبناء ) | دروست کردن | |
| انشـاء ( للکتابه ) | نوسین ، داڕشتن | |
| انضـمام | لەگەڵ کەوتن ، هـاتنە ناو | |
| انفکاك (عن الوظیفة) | ترازان | |

| | | |
|---|---|---|
| انقاص الراتب | مووچه کەم کردنەوە | بڕوانە : « راتب » . |
| انقطاع عن العمل | لە کار دابڕان | |
| انهاء الخدمة | بڕینەوەی خزمەت | بڕوانە : « خدمە ». |
| أهليـة | شـيـان | دەگوترێت : ئەو کابرایە شیانی هەیە. |
| ـ متأهل | شيـاو | |
| اهــمال | کەمتەرخەمێتی ، خاوێلکەیتی | |
| ـ مهمـل | کەمتەرخەم، خاوێلکە | بڕوانە : « مهمل ». |
| اهميـة | گرنگتی | بڕوانە : « مهم » . |
| أوراق الاعتماد | بڕوانـامە | دەتوانین بڵێین : باڵیـۆزی میسـر بڕوانامەی خـۆی پێشـکەش بە سەرەك کۆمار کرد ... |
| الاوعية الدموية | خوێنەڕۆ | وەك زاراوێـکی زانسـتی رووت ؛ (خوێنەڕۆ) قیاس لەسەر ئاوەڕۆ . |
| ايداع (الايداع في المصرف) | دانـان | |
| ايفـاد | ناردن | |
| ايقاف ( للمعاملة ) | وەستاندن ، راگرتن | |
| ايقاف ( اعتقال ) | گـرتن | |
| ـ توقيف | گـرتن | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ موقوف | گـرتوو | لە ناو بڵباس و ناوچەی پژدەردا دەڵێن : گـرتووکانیان برد ، چـوونە لای گرتـووکانیـان ، دوازدە گرتوویان رەوانە کرد ... |
| ـ الموقف | گـرتووخانە | |

## ـ ب ـ

| | | |
|---|---|---|
| باحث | توێژەر | Researcher |
| ـ بحث (تحقیق) | توێژینەوە | Research ؛ بڕوانە : «تحقیق» . |
| ـ مباحثه | لێ دوان | |
| باطني | دەروونی | |
| بـدالة | بکۆڕی تەلەفون | |
| براءة (ذمة) | گـەردن ئازادی | دەوران دەور ئەدا بۆ نامرادی با لە بـەینا بێ گەردن ئازادی (مەولەوی) |
| بـرّاد | فیتەر | |
| برنامج | بەرنامـە | |
| بروفیسور | پرۆفیسۆر | |
| برقیـة | بروسکە | |
| بریـد | پۆستە | دەگوترێت : پۆستەی ئەمڕۆ گـەیشت . |
| ـ إدارة البرید (کمحل لاستلام البرید) | پۆستەخانە | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ دائرة البريد (كمحل للاعمال الادارية) | فەرمانگەی پۆستە | بڕوانە : « دائرة » . |
| ـ دائرة البريد والبرق والتلفون | فەرمانگەی پۆستەو تەلگرافو تەلەفون | |
| بصورة اعتيادية | بە شێوەیەکی ئاسایی | |
| بضاعة | شمەك | . کورت کراوەی ( شتومەك ) ە ؛ لە هەندێك ناوچەی کوردستان ( شمەك ) بەکار دەهێنرێت . |
| بطاقة | کارت | |
| بقايا | بەرماوە | |
| بلاغ | راگەیاندن | ( پێراگەیاندن ) هەڵەیە چونکە بە مانای ( پێ گەیشتن و فریاکەوتن دێت ) [ وەك : پێمدا راگەیشت ، پێمدا یا پێمدا رابگە ... ] ؛ دەتوانین بڵێین : راگەیاندنی یەکەم ... ؛ بڕوانە : « ابلاغ » و « اخطار » . |
| ـ البلاغ النهائي | دواراگەیاندن | |
| بند | بەند | |
| بواب | دەرگەوان | |

| | | |
|---|---|---|
| بيان قيام الزوجية | خێزان نامه | بڕوانه : « اعلام الزوجية » . |
| بيئة ( محيط ) | ژیانگه ، ژینگه | واته جێگەی ژیان . |
| بيطـرة | بەيتاڵخانه | |
| ـ البيطرى | بەيتاڵ | |
| بيـــع | فرۆشتن | |
| ـ بائع | فرۆشیار | پێچەوانەکەی : کڕیار . |
| ـ بائع الجملة | کۆفرۆش | |
| ـ بائع المفرد | تاك فرۆش | |
| بيوت الشعر | رەشماڵ ، دەوار | |

## ـ ت ـ

| | | |
|---|---|---|
| تـاجــــر | بازرگان | زۆر دەمێکە لە زۆربەی کوردستان باوە ؛ بڕوانە : « تجارة » . |
| تأريخ ( زمن ) | رۆژ یا ساڵ | ( رۆژ ) : بەرامبەر بە ( Dtae )ی ئینگلیزی . |
| تأريخ (علم التأريخ) | مێژوو | لە دەمێکەوە باوە . |
| تأسيس | دامەزراندن | ( دامەزراندن ) بە واتای تـریش دێت ؛ بڕوانە : « توظيف » و « تعيين » . |
| تأشـــير | نیشان کردن | |

| | | |
|---|---|---|
| تحديد الاجر | بڕینەوەی کرێ | بڕوانە : « الأجر » . |
| تحريرياً | بەنوسین | |
| تأكيد | دوپات | ( پات ) لە کوردیدا بە مانای ( طبقة ) دێت ؛ دەگوترێت : سواغی سەربانەکەتان چەند پاتە ؟ ، پات پاتە . . . |
| تأليف | دانان | |
| ـ التأليف والنشر | دانانو بڵاوکردنەوە | |
| تأهيل | شیاندن | لە شیانەوە وەرگیراوە ؛ قیاس لەسەر : ناساندن . . . ؛ بڕوانە : « أهلية » . |
| تأييد | لاگیری | |
| ـ أوءيد | لاگیرم | |
| تبادل ( الأسرى ) او ( الاشخاص ) | پێك گۆڕینەوە | |
| تبادل ( للبضائع ) | ئاڵوگۆڕ | ئاڵوگۆڕ بە مانای تربش دێت؛ بڕوانە : « تنقلات الموظفين » . |
| تبادل ( للوظيفة ) | جێگۆڕکێ | |
| تبرع | باربو | بڕوانە : « إكتتاب » . |
| تبليغ | راگەیاندن | بڕوانە : « إبلاغ » . |
| تثبيت ( للوظيفة ) | جێگیربوون | ثبت في وظيفته = جێگیر کرا . . . |
| تثمين (تقدير القيمة) | قرساندن | لە لادێ بەکار دەهێنرێت . |
| تجاره | بازرگانی | بڕوانە : « تاجر » . |
| تجنيد | سەربازگری | |

| | | |
|---|---|---|
| تحريض | دنه | دەگوترێت : دنەی دەدا . |
| تحضير ( الشيء ) | ئامادەکردن | |
| تحضير (كيمياوى) | سازکردن | |
| تحقيق | کۆڵینەوە | |
| تحقيق ( بحث ) | تۆژینەوە | Rescarch ؛ بڕوانە : «باحث». |
| تحقيق ( الشرطة ) | لێ کۆڵینەوە ، پەیجۆر | شێخ محەمەدی خاڵو مەردۆخ ( پەیجۆر ) یان بەکار هێناوە ( بڕوانە : «فەرهەنگی خاڵ» ، بەرگی ١ ، ل٢٤٢ ؛ مەردۆخ، بەرگی یەکەم ، ل ٢٤٢) . |
| تحكيم | پشکاندن ، بەرەڤانی | لە بادینان ( بەرەڤان ) بەکار دەهێنن ؛ دەگوترێت : ڤەرە بەرەڤانیمان بکە ... لە ناو کوردی سۆڤێتدا ( بەرەڤان ) بە مانای « إتجاه » و « توجیه » دێت ( بڕوانە : Q. Kurdo..., L. 76) |
| ـ حکم | بەرەڤان | بڕوانە : « حکم » . |
| تحيز | لایەنگیری | |
| تخصيص | دانان | دەگوترێ : ئەم دارەمان بۆ زستان داناوە ... « تەرخان » وشەیەکی تورکی کۆنەو مانای تەواوی « تخصیص » ناگرێتەوە ؛ وشەی « تەرخان » لە ناوچەی موکریان بە مانای «مستثنی من المسؤولیه» دێت ، لەوی دەڵێن : ئێمە = |

| | | |
|---|---|---|
| | | = بێلارمان له سەرە هەمۆ کەس وەك تۆ نییە تەرخان کرابێت ؛ له ناو کوردی سۆڤیێتدا (تەرخان) بۆ هەمان مەبەست بەکار دەهێنرێت (Q. Kurdo...,L.742 : بڕوانە) |
| تخطيط | پلان دانان | له زمانە ئەوروپاییەکاندا ( رۆسی نەبێت ) دەنگی پیتی (ل) ی ناو وشەی ( پلان ) قەڵەو نییە ؛ بڕوانە : « خطة » . |
| تخمين | خەمڵ ـ خەمڵاندن | له زۆربەی لادێکانی کوردستان بەکار دەهێنرێت . |
| ـ مخمن | خەمڵێنەر | |
| تخويل الصلاحيات | دەسەلات پێدان | دەسەلاتی پێ درا «He poured» |
| تـداوی | دەرمانکردن | |
| التدبير المنزلي | بنەوانی | وانە بەڕێوەبردنو سەرپەرشتی کردنی بنە ( بنە = «مرکز» ) ؛ له کوردەوارێدا ( بنەوان ) بەو ئافرەتە دەڵێن کە سەرپەرشتی ماڵ دەکات ؛ دەگوترێت : دایکیان مردوە ، کێ بنەوانە ... |
| تدريب | مەشق | بۆ فێرکردنو راهێنان بە هەمۆ کارێك ؛ مەلای کورد دەڵێت : مەشقی نوسین بە شاگردەکان دەکەم ؛ سەربازیش مەشق دەکات ؛ هەروەها دەشێ بڵێین : ئیمساڵ پەنجا کرێکارمان ناردە ئەوروپا بۆ مەشق لە چەند بەشکەیەك ...؛ بڕوانە : « تمرين » . |

| | | |
|---|---|---|
| تدريجياً | بەرە بەرە | |
| تدريس | دەرس وتنەوە | بڕوانە : « درس » . |
| تراث | کەلەپوور | لە ناو خوێندەواری کورددا بلاوە . |
| تربية | پەروەردە | |
| ـ التربية والتعليم | پەروەردەو فێرکرن | بڕوانە : « تعليم » . |
| ـ التربية الرياضية | وەرزش | |
| ـ التربية الكشفية | پەروەردەی پێشەنگتی | |
| ترجمة | وەرگێڕان | |
| ترجمة الحال | ژینامە | لە ( ژین نامە ) وە وەرگیراوە بە مانای « Autobiography » . |
| ترسب | نیشتن | |
| ـ مرسب ومترسب | نیشتوو | |
| ترشيح (للانتخابات) | ناودێر ، نامزەد | دەگوترێت : یاخوا منداڵەکەت ناودێر بێت ، واتە « مشهور » بێت ؛ ( نامزەد ) لە ( ناوزەد )ەوە وەرگیراوەو لە کوردستانی ئێران باوە ؛ هەردووکیان بۆ دەزگیرانیش بەکار دەهێنرێن ؛ دەگوترێت : ئەو کیژە ناوزەدی مستۆیە ، واتە « مرشح » ە بۆ مستۆ ... |
| ترشيح ( للكيمياء) | پالاوتن | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ آلة الترشيح | پاڵوێنه | بڕوانه : « آلة الترشيح » . |
| ترفيع (للوظيفة) | پله پێدان ، بەرزکردنەوە | |
| ترميم | چاك کردنەوە ، دەست پیاهێنان | |
| تزكيه | پەسند | |
| تزيين | رازاندنەوە | شار رازێنرایەوە . |
| تسجيل | تۆمارکردن | ئەم وشەیەمان لە سەردەمێکی کۆنەوە بۆ ماوەتەوە ، زۆ نامە بە سریش بە یەکەوە دەلکێنران و بەمە دەوترا ( تۆمار ) . |
| تسلسل | زنجیرە | بڕوانە : « سلسلة » . |
| تسلم | وەرگرتن | بڕوانە : « استلام » . |
| ـ تسليم | پێدان | |
| ـ مستلم | وەرگرتە | |
| تسهيل | ئاسان کردن | بڕوانە : « سهل » . |
| تشكيل | پێك هێنان | دەتوانین بڵێین : چوار مامۆستای ناسراو لیژنەی زمانیان پێك هێنا . |
| تصدير | هەناردن | لەسەر وەزنی ( هاوردن ) کە بۆ « إستيراد » دانراوە ؛ بڕوانە : « إستيراد » . |
| ـ صادرات | هەناردراو | بڕوانە : « صادرات » . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ مصدرة | نارده | لەسەر وەزنی ( هاورده ) دانراوه ؛ بڕوانە : « مستورده » و « إستيراد » . |
| تصديق | راستاندن | وەك : نرخاندن ، برزاندن . . . ؛ دەتوانین بڵێین : بیڕاستێنه ، دەڕاستێنم ، بڕاستێنه ، راستاندی .. |
| تصرف | دەستكاری | |
| تصريح | ئاشكرا كردن | |
| تصفيف | ریزكردن | |
| تصفية ( كترشيح وتنظيف ) | پارزنین | له ( پارزۆنگ ) ەوه وەرگیراوه ؛ له هەندێك ناوچەی كوردستان له بریتی ( چاپاڵێنو ) ( پارزۆنگ ) بەكار دەهێنن ؛ بڕوانە : « مصفاة » . |
| تصفية الحساب | پاكتاوكردن | دەگوترێت : پاكتاویان كرد . |
| تصليح | چاك كردنەوه | |
| تصميم | نەخشه كێشان | |
| تصنيف | بابەت كردن | بڕوانه : « صنف » . |
| تضاد | دژكاری | پێچەوانەی ( لایەنگیری ) یه. |
| تضامن | هاوئەرك | |
| ـ متضامن | هاوئەركتی | |
| تضميد | تیمار كردن | |

| | | |
|---|---|---|
| تطابق | یەكچین كردن | بە ئینگلیزی « Similarity » كە مانای « تشابە » و « تماثل » ئەگرێتەوە . یەك چینی بكە ، واتە « تطابق » ی پێ بكە . |
| ـ مطابق | یەكچین | |
| تطبیقات | راهاتن | دەگوترێت : لە ماڵە گاور راهێنراوە ؛ ئەو رای هێنا ... |
| تعـــاون | هەرەوەز | لە لادێ زۆر باوە ، زۆر جار جوتیاری گوند یا ناوچەیەك لە كاتی جوتو دروێنەدا هەرەوەز دەكەن . |
| ـ التعاونیە | هەرەوەزی | |
| تعـداد | ژماردن | |
| تعذیب | ئازاردان | |
| تعریف ( شخصي ) | ناساندن | وەك : راستاندن ، نرخاندن ... ؛ دەتوانین بڵێین : بیناسێنە ، پێم بناسێنە ... |
| تعریف (مصطلح) | دیار كردن | « تعریف » وەك « تحدید »ە ، « تحدید » یش بە كوردی دیار كردنە ؛ دیاری بكە ، دیاریكرد... |
| ـ معرف | دیاردە | |
| تعزیـــة | پرسە | |
| تعقد | ئاڵۆزی | |
| ـ تعقیـد | ئاڵۆزی | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ معقـد | ئاڵـۆزاو | دەتوانین بڵێین : ئەم باسە باسێکی یەکجار ئاڵۆزاوە ، یا ئاڵۆزە ... |
| تعقیب (عن أمر او شیء ما) | ســۆراخ | دەگوترێـت : زۆر سـۆراخی ئەم هەواڵە بوین . . . |
| تعقیب ( للمعاملة ) | دوَکەوتن | ( دوا کەوتن ) هەڵەیە چونکە بـە مانای « تأخر » دێت ، دەگوترێت : دوّی کارەکەی کەوت ... |
| تـعلیم | فێرکردن | بڕوانە : « التربیه والتعلیم » . |
| تعهـد | دەستەبەرێ | |
| ـ متعهد(مقاول) | دەستەبەر | بڕوانە : « مقاول » . |
| تعویـد | راهێنان | |
| تعویـض | بژاردن | دەگـوترێت : پێت دەبژێرم کە لە ( پێت دەژمێرم ) ەوە هاتوە . |
| تعیـین | دامەزراندن | بڕوانە : « توظیف» . |
| تفتیش | پشـکنین | |
| ـ مفتـش | پشکنەر | |
| تفریق | جیا کردنەوە | |
| تفسـیر | راڤــە | لە زاری زازادا بەکار دەهێنرێت ، بڕوانـە : « فەرهەنـگی خاڵ » ، بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ١٧٤ ؛ کوردی سۆڤێت ( راڤەك ـ راڤەکرن ) بەکار دەهێنن (بڕوانە : Q. Kurdo ..., L. 630). |

| | | |
|---|---|---|
| تفقـــد | ســەردان ، بەسەرکردنەوە | |
| تقـاليد | نەریـت | |
| تقدیـر (تخمین) | خەمـــڵ | بڕوانە : « تخمین » . |
| تقدیر (للاحترام) | ڕێز لێنان | |
| تقدیر (للتشجیع) | ئـــافەرین | وەك بڵێین : دوَ موّچە خـۆری شارەوانێ کەرکوك ئافەرین کران. |
| تقدیـم | پێشکەش کردن | |
| ـ تقدیم (تفضیل) | پێشخستن | |
| تقریـر | راپۆرت | لە زمانی فەرەنسیدا دوا پیتی وشەی ( Report ) ناخـوێندرێتـەوە ، بەکوردیش دەتوانین بڵێین (رابۆر). |
| تقصـیر | درێغـی | |
| تقلـص | چوّنەیەك | |
| تقلیص (الکلفە او المبلغ) | کەم کردنەوە | |
| تقییم | نـرخاندن | قیاس لەسەر : خەملاندن ، قرساندن ... |
| تکـرار | دوَبارەکردنەوە | |
| تکـوین (بمعنی تألیف) | پێـکهێنان | وەك پێكهێنانی وەزارەت . |

| | | |
|---|---|---|
| تلميذ | شاگرد | بۆ فێرگەی سەرەتایی . ( شاگرد ) لە دەمێکەوە باوە ، شێخ مارفی نۆدێ دەڵێت : « تلميذ شاگردە... » ( بڕوانە : « أحمدی »، ل ٨ ) ، زێوەر دەڵێت :<br>ئەی شاگردانی مدرسە<br>راحەتی ئیتر بەسە ؛<br>حەمدی دەڵێت : « شاگردانی عیشق ... » ؛ هەموو فێرگەکانی کۆماری مەهاباد ( شاگرد ) یان بەکار دەهێنا ؛ ( شاگرد ) لەکوردستانی ئێران تا ئێستاش باوە ؛ « قوتابی » لە « کتابی » یەوە وەرگیراوە ؛ کوردی سۆڤێتیش ( شاگرت ) بەکار دەهێنن وە بە زۆری فێرگەش دەڵێن : شاگرتخانە ( Q. Kurdo ..., L. 692 )، بڕوانە : « طالب » . |
| تمديد | درێژکردنەوە | |
| تمرد | یاخیگەری ، سەرپێچی | |
| ـ متمرد | یاخی ، سەرپێچ | |
| تمرين | مەشق | بڕوانە : « تدريب » . |
| تمشية | ڕەواندن | دەتوانین بڵێین : کارەکەی خێرا ڕەوێندرا . . |

| | | |
|---|---|---|
| تمهیـــد | هەموار | لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکار دەهێنرێت ؛ دەگوترێت : رێگەیەکی هەموارە ؛ بڕوانە : «وعر» . |
| تناسـل | زاووزێ | |
| تنافس | هاوچاوێ | بڕوانە : « منافس » و « منافسه ». |
| تنبیـــه | تەمیـــه | |
| تنحیـــه | هەڵپەساردن | |
| تنزیـــل | داشـکاندن | |
| ـ تنزیل درجه | پایه داشکاندن | بڕوانە : « درجه » . |
| تنظـــیم | رێکخستن | |
| تنقلات ( للموظفین ) | ئاڵو گۆڕ | دەتوانین بڵێین : ئـاڵو گۆڕی مۆچەخۆران ، یان کاربەدەستان ... |
| تنقیـح ( التبـغ ) | بـژار | لە لادێ دەڵێن : بابچینه بزارێ ، بزارمان کـرد ... |
| تنقیـــط | خاڵبەندی | بە واتـای ( Punctuation ) ی ئینگلیزێ ؛ بڕوانە : «نقطة» . |
| تهدیـد | هەڕەشـه | بڕوانە : « انذار » . |
| تهریـب | قاچـاخ | خـوا ببڕێ پیشـەی قازاخی<br>بە شەو قەرەوڵ بە رۆژ قاچاخێ<br>( فۆلکلۆری کوردێ ) |
| ـ مهـرب | قاچاخچی | |
| توبیـــخ | سەرزەنشت | بڕوانە : « إنذار » . |
| توتـر | گـرژ | وەك ( Tention )ی ئینگلیزی . |

| | | |
|---|---|---|
| توجيه | ئاراستـه | |
| ـ سنة التوجيه | ساڵی ئاراستەکردن | |
| ـ السنة التوجيهية | ساڵی ئاراستەیی | |
| توسيـع | فرەواندن | لە ( فـرەوان )ەوە وەرگیراوە کە واتای ( گوشاد ) دەبـەخشێت ؛ لەســەر زمان لە ( فراوانـدن ) سوکترە ؛ ( فراوان ) لە فارسیدا بە مانای ( زۆر ) هەیە ، بەڵام ( فرەوان ) یان نییـە ؛ قیاس لەسەر : رەواندن ، خەساندن ، قرساندن ... |
| توصيـة | راسپاردن | بڕوانە : « وصية » . |
| توظيف | دامەزراندن | بڕوانە : « تعيين » . |
| توفـير | پاشەکەوت | |
| توقيـع | ئیمـزا | ( توقيع ) وەك کار = ئیمزا کردن ، وەك بڵێیت : ئەو بـڕیارە بـەرە بۆ ئیمزا کردن ... |
| توقيف | گرتن | بڕوانە : « إيقاف ـ إعتقال » . |

## ـ ث ـ

| | |
|---|---|
| ثـابت | چەسپاو |
| ثانية | چـرکە |
| ثـروة | سـامان |

| | | |
|---|---|---|
| ثغرة | كەلێن | |
| ثقافة | رۆشنبیری | |
| - مثقف | رۆشنبیر | |
| ثقة | بڕوا | ( متمانە ) لە « إطمئنان » ی عەرەبیەوە وەرگیراوە . |
| ثمن | نرخ | |
| ثورة | شۆڕش | |
| - ثائر | شۆڕشگێڕ | |

## - ج -

| | | |
|---|---|---|
| جائزة | خەلات ، پاداشت | |
| جابی | باجگر | خۆزگە باجگری ماچان بام<br>لە سەر پردی باسان<br>- فۆلكلۆری كوردی - |
| جامعة | زانكۆ | لەسەر شێوەی كۆكردنەوەو داڕشتنی ( بكوژ )و ( پیاو )و بەرودوا پێكردنیان و كورت كردنەوەی وشەی ( بكوژ ) بۆ ( كوژ ) كە ئەبێ بە ( پیاوكوژ ) ، وە گەلێ نموونەی تری لەم بابەتە رستەی ( كۆكەرەوەی زانین ) « جامعة العلوم والمعارف » هێنراوەو لە وشەی یەكەم (كۆ)و لە وشەی دووهەم (زان) وەرگیراوەو بەرودوایان پێكراوەو بووە بە= |

= ( زانـكۆ ) . لەم جۆرە پێكهێنانانەدا هەمیشە ئەو وشەیەی مانای ( كار ) دەگەیەنێ لە دواوەو ئەو وشەیەش كە مانای (كراو )ەكە دەگەیەنێ لە پێشەوەیە ، وەك : جلدرۆ ، مەڕدۆش ، بزنمژ ... ؛ كورت كردنەوەی وشەی (زانین)یش بۆ ( زان ) رەوایە هەروەك چۆن لە وشەی (زانیاری)دا كراوە ؛ بڕوانە « كلية » .

| | | |
|---|---|---|
| جاهل | نەزان | |
| جبهة | پێشگە | |
| ـ جبهة القتال | پێشگەی شەڕ | |
| جبهة (في السياسة) | بەرە | ئەم زاراوە دەمێكە جێگەی خۆی لە ناو خوێندەوارانی كورددا گرتوە. |
| ـ الجبهة الوطنية الموحدة | بەرەی نیشتمانیی یەكگرتو | |
| جدارة | شایان | لە ( شیان ) ەوە وەرگیراوە ؛ بڕوانە : « جدير » . |
| جدول | خشتە | لە كتێبی فێرگەكاندا هەمان وشە بەكار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٩ ، ١٤٧ ) . |
| ـ جدول الدروس | خشتەی دەرسەكان | |
| ـ جدول الدروس الاسبوعية | خشتەی دەرسی حەفتانە | |

| | | |
|---|---|---|
| جدول ( الماء ) | جۆگە | |
| جديـر | شایان | بڕوانە : « جدارة » . |
| جـراح | برینـکار | |
| جراحـة | برینـکاری | |
| - عملية جراحية | برینـکاری | دەتوانین بڵێین : دوکتۆر ئەمڕۆ سێ برینکاری کرد ... |
| - فرع الجراحة | لکی برینـکاری | |
| - قسم الجراحة | بەشی برینـکاری | |
| جـرس | زەنـگ ، زیـل | |
| جريمـة | تاوان | بڕوانە : « جنایه » ، « جنحه » و « مخالفة » . |
| - مجـرم | تاوانبار | |
| جـزاء | ســزا | |
| جزافـاً | گـۆترە | |
| جـزية | ســەرانە | بڕوانە : « ضريبة الرأس » . |
| جماهير | کـۆمەلان | ( جەماوەر ) راست نییە ، لە ( جمع آور )ەوە وەرگیراوە کە مانای ( حاصل جمع )ە . |
| - جماهير الشعب | کۆمەلانی خەڵك | لە چاپەمەنی کۆمەڵەو مەهابادا بەکار دەهێنرا . |
| جمـع | کۆکردنەوە | |
| جملة ( كمصطلـح اقتصادي ) | سـەروبەر | دەگوترێت : سەروبەری تێدا چوو ، بە سەروبەرەوە تێدا چووم .... |

| | | |
|---|---|---|
| جملة (كمصطلح لغوي) | رستە | |
| ـ شبه جملە | ساڕستە | ( سا ) بە مانای ( وەكو ) ؛ لە بارەی وردكردنەوەی ( سا )وە بڕوانە : « شبه رسمي » . |
| جناية (كمصطلح قانوني) | كەتن | دەڵێن : كەتنێكی گەورەی كرد ؛ بڕوانە : « جريمه » ، « جنحه » و مخالفة . |
| جنحة (كمصطلح قانونی) | گوناح | بڕوانە : « جريمه » ، « جناية » و « مخالفة » هەروەها « أحدی » ، ل ٣ . |
| جندی | سەرباز | |
| جنس | نەژاد | بەرامبەر بە « Race » . |
| جنسية | زێدياری | بەرامبەر بە « Nationality » ؛ لە زۆربەی فەرهەنگە كوردیێكاندا ( زێد ) بە مانای نیشتمان هاتوە ؛ مەردۆخ بەرامبەر بە ( زێد ) ( بوم ، میهەن ، ئارامگاه ، وطن ، موطن ، مولد ومسكن )ی داناوە ( بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ٨٢١ ) ؛ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس لە فەرهەنگەكەیاندا ( زێد ) یان بە « Region » و « Country » لێك داوەتەوە ( T. Wahby,... p. 166 ) شێخ محەمەدی خاڵ (فەرهەنگی خاڵ ، بەرگی ـ ٢ ـ ، |

= ل ٢٣٥)وه حه‌ین حوزنی (زێد) یان به هه‌مان واتا به‌كار هێناوه .

| | | |
|---|---|---|
| ـ شهادة الجنسية | زێدنـامه | |
| جنـوب | باشـوور | له كتێبی فێرگه‌كاندا هه‌مان وشه به‌كار هێنراوه (« پـه‌روه‌رده‌و زانست ») ؛ بڕوانه : « شمال » . |
| جهـاز (مؤسسة) | ده‌زگـا | بڕوانه : « مؤسسة » . |
| جهـاز (كمصطلح طبي) | رشـته | (رشته) به مانای « سلسله »و « تسلسل » دێت ؛ مه‌ردۆخ له به‌رگی دووه‌می فه‌رهه‌نگه‌كه‌یدا (ل ٨٧٨) «زنجیره»و «سلسله»ی به‌رامبه‌ر به (رشته) داناوه ؛ له هوموو (جهاز)ێكدا جۆره « تسلسل »ێك هه‌یه . |
| ـ الجهاز البولي | رشته‌ی مێـز | |
| ـ الجهاز التناسلي | رشته‌ی وه‌چه | (وه‌چه) مانای (نسل)ه ، ده‌گوترێت : وه‌چه‌یه‌كی زۆریان لێ كه‌وتۆته‌وه ؛ دوور نییه (وه‌چه) له (به‌چه) وه هاتبێت ؛ (وه‌چه) له كشتوكاڵیشدا به‌كار ده‌هێنرێت ، وه‌ك : وه‌چه‌ی توتن یا درخت...؛ مه‌ردۆخ به‌رامبه‌ر (وه‌چه) (شاخه ، فه‌رزه‌ند ، ولد وه ابن)ی داناوه (به‌رگی ـ ٢ ـ ، ل ٨٢٣) . |
| ـ الجهاز التنفسي | رشته‌ی هه‌ناسه | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ جهاز دوران الدم | رشتەی خولی خوێن | |
| ـ الجهاز العصبي | رشتەی دەماران | |
| ـ الجهاز الهضمي | رشتەی هەزم | لە کتێبی فێرگەکاندا ( ئەزم ) بەکار هێنراوە ( «پەروەردەو زانست» ، ل ٧٠ ) . |
| جهد | کۆشش | |
| جهة | لا | |
| ـ جهة (سياسية) | لایەن | |
| جواب | وەڵام | |
| جواز السفر | پەساپۆرت | |
| جوال | گەڕیدە | لە گەڕانەوە هاتوە . |
| جيد | باش | وەك « Good » . |
| ـ جيد جداً | زۆر باش | وەك « Very good » ؛ بڕوانە : « ممتاز » . |
| جيش | سوپا | |
| جيل | بەرەباب | لە دێهاتی موکریان دەڵێن : دە بەرەباب هاتنە خوارێ ؛ لە هەندێك ناوچەی کوردەواری ( بەرەباب ) بە مانای ( تایفە ) بەکار دەهێنرێت ؛ ( بەرە ) بە تەنها بۆ «جبهة» بەکار دەهێنرێت . |

# - ح -

| | | |
|---|---|---|
| حاجز | لەمپەر | دەگوترێت : چ لەمپەری لەبەردا نییە ، لەمپەرێك لە نێوان هەردوو خەرمانەکەدا دانراوە ، رۆیشتو لەمپەری نەهاتە رێ ... |
| حارس | پاسەوان | |
| حاشیة الکتاب | پەراوێز | |
| حاضر | حازر | لە هەموو قوژبنێکی کوردستان هەموو کەسێك لە ( حازر ) تێ دەگات ؛ دەگوترێت : حازروبزر ، وەك تای تەورداس حازرم ... |
| ـ حضور | حازربوون | |
| حافة | کەنار ، قەراغ | |
| حاکم | دادکار | وانە : ( داد ) کارێتی یان کاری ( داد ) ە ؛ بڕوانە : « محکمة » و « عادل » . |
| حامیة | هۆردو | زۆر دەمێکە لە رێگەی زمانی ( تورکی ) یەوە تێکەل بە زمانی کوردی بووەو جۆری دارشتنی گۆڕاوە ؛ دەگوترێت : هۆردویەك منداڵی بە دواوەیە ، هۆردوکایان لەوێ بوو... |
| حانوت | دوکان | |
| ـ حانوت مدرسی | دوکانی فێرگە | بڕوانە : « مدرسة » . |

| | | |
|---|---|---|
| حث | هاندان | ماموّستایان توّفیـق وەهـبیو ئەدموّنـس لە فـەرهەنگەکەیاندا ( هاندان ) یان بوّ هەمانواتا داناوە ( T. Wahby,... p. 58 ) |
| الحجر الصحي | دابڕینی پزیشکی | بڕوانە : « طبیب » . |
| حجز | گلدانەوە | |
| حجم ( مصطلح هندسی ) | بارست | دەگوترێت : بە بارستایی ... |
| حد | رادە | |
| حدود ( الحدود الجغرافية ) | سنوّر | |
| الحديقة المدرسية | باخچەی فێرگە | بڕوانە : « مدرسة » . |
| حريص | رژد | لە زوّر ناوچەی سـوّران بەکار دەهێنرێت ؛ دەگوترێت : لەسـەر ئەوکارە رژدە ؛ لە هەندێك ناوچە دەڵێن ( رشـت ) ؛ لە موکریان ( رژد ) بە مانای بەخیل بەکار دەهێنرێت ؛ مەردوّخ ( رژد ) ی بوّ هەردوّکیان بەکار هێنـاوە ( بەرگی ـ ١ ـ ، ل٨٧٤ ) ، بەلام شێخ مارفی نوّدێ تەنها « شحيح »و « لئيم » و « بخيل » ی داناوە ( « احدی » ، ل ٥ ) . |
| حريـق | سـوتمان | |
| حسابات | هەژمار | کـوردی سـوّڤێت ( هەژمار ) و ( هـەژمار کـرن ) بەکار دەهێنن ( Q. Kurdo,... L. 303 ) |

| | | |
|---|---|---|
| تحسن السلوك | پاك رەوشت | پێچەوانەکەی : ( بەدڕەوشـت ) ؛<br>بڕوانە : « سيء السلوك » ؛<br>گوتم ئەی کیژ لە گەشتی<br>وا جـوانو پـاك رەوشـتی<br>شیعری عوسمان عەونی |
| حُسن السلوك | پاك رەوشتی | دەتوانین بڵێین : چالاك پـاك رەوشتە . . . |
| حشرة | گەزندە | واتە ئەو جانەوەرانەی دەگەزن . |
| حشو ( مصدر ) | ئاخنین | |
| ـ حشو ( إسم ) | ناوئاخن | |
| حصه ( سهم ) | پشـــك | لە ناوچەی بادینان باوە ؛ دەگوترێت: سەرپشك بە ، واتە لە پێشدا بەشی خۆت هەڵبگرە ؛ ( تیرو پشك ) هەیە کە بە مانای « قرعه » دێت . |
| حضارة | ژیار | لە هەندێك ناوچەی بادینان باوە ؛ دوور نییە لە ( ژین )ەوە هاتبێت ؛ دەگوترێت : لانکی ژینو ژیـارە « مهـد الحيـاة و الحضـارە » ؛ ( شـارسـتـانێتی ) پڕ بە بەرگی ( مدنية ) يە . |
| ـ متحضر | ژیوەر | |
| حظيرة | دەستە | بۆ سوبا . |
| حفار | کوڵەر | |
| حفظ | لەبەرکردن | |

| | | |
|---|---|---|
| حفظ (الاوراق) | هەڵگرتن | |
| ـ يحفظ | هەڵگیرێ | |
| حفلة | ئاهەنگ | بۆ مەبەستێك یا دانیشتنێكی بجوك . |
| حفلة | بەزم | ئەگەر ئاهەنگەكە گەورە بێ ؛<br>شێخ رەزا دەڵێت :<br>هەتانە هەر وەكو بیستومە بەزمێك<br>لە ساڵێكدا شەوێك یارانی دیندار<br>هەروەها دەڵێت :<br>ئەسبابی طەرەب زیلو بەمە ، ئەی بەگی جافان<br>با بەزمێ بسازێنین ، لە من (زیل)و لە تۆ ( بەم ) |
| حفید (أحفاد) | نەوە | شێخ مارفی نۆدێ لە «ئەحمەدیێ» دا دەڵێت :<br>«هـلال» مانگی یەك شەوەیە<br>« حفید و حافد » نەوەیە<br>(واحدی» ، ل ٦ ) . |
| حقل | خانە | دەگوترێت : خانەی یەكەم ... |
| حقل ( مزرعة ) | كێڵگە | لە دەمێكەوە باوە ؛ لە كتێبی فێرگەكاندا هەمان وشە بەكار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست »، ل ٣٠ ) . |
| حكم | پەرەڤان | لە بادینان باوە ؛ دەگوترێت : قەرە بەرەڤانیان بكە ... ؛ بڕوانە : « تحكيم » . |
| حكومة | مێری | |

| | | |
|---|---|---|
| - حكومي | میری | |
| حلف | پەیمان | بڕوانە : « معاهدة » . |
| حلقة | گەو | دەگوترێت : زنجیرێکی بیست گەوی ، گەوی رەشکە ... |
| الحماية الشخصية | تەن پارێزی | بڕوانە : « السلامة الشخصية » . |
| حوالة بريدية | حەواڵە | |
| حيله | فێڵ ، گزی | |
| - حيال | فێڵباز | |

## - خ -

| | | |
|---|---|---|
| خاتمة | کۆتایی | |
| خادم | نۆکەر | لە ( نوێ کار ) یا ( نەو کار )ەوە وەرگیراوە . |
| خارجي | دەرەکی | پێچەوانەکەی : ناوەکی ؛ بڕوانە : « داخلي » . |
| خارطة | نەخشە | دەمێکە باوە ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە (« پەروەردەو زانست »، ل ٣٥) . |
| خاصة | تایبەتی | |
| - خصوصي | تایبەتی | لە موکریان زۆر باوە . |
| خبرة | شارەزایی | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ خبير | شارەزا ، بەڵەد | ( بەڵەد ) لە کوردستانی ئێران باوە ؛ دەگوترێت : پیاوێکی زۆر بەڵەدە ، با بڕوا بۆ خۆی بەڵەدە ... |
| ختم | مۆر | ( مۆر کردن ) بۆ کارەکەی . |
| خدمات صحية | خزمەتی تەندروستی | بڕوانە : « صحة البدن » . |
| خدمة | خزمەت | لە هەمـوو ناوچەیەکی کوردستان باوە ؛ دەگوترێت : خزمەتی زۆرە ، پیاوێکی بە خزمەتە ... |
| ـ الخدمة الجامعية | خزمەتی زانکۆیێتی | |
| ـ الخدمة القضائية | خزمەتی داوەری | |
| ـ الخدمة المدنية | خزمەتی ژیاری | |
| ـ إنتهاء الخدمة | بڕانەوەی خزمەت | |
| ـ إنهاء الخدمة | بڕینەوەی خزمەت | |
| خزينه | خەزێنە | زۆر باوە ؛ دەگوترێت : خەزێنەی دۆزیوەتەوە ، وەك مشکی سەر خەزێنە وایە ... |
| خطبة | دوان | ( وتار ) ( مقال )ە نەك ( خطبة ) . |
| ـ خطيب | دوانبێژ ، بێژە | |
| خطر | مەترسی | |
| خطير | ترسناك | بڕوانە : « مخيف » . |
| خطة | پلان | بڕوانە : « تخطيط » . |
| خلاصة | پوختە | دەگوترێت : ئەمـە پوختەی ئـەو کارانەن کە ئیمـاڵ جۆ بەجۆ کراون. |

| | | |
|---|---|---|
| خط (کمصطلح کیمیاوی) | تێکەڵ کردن | |

## - د -

| | | |
|---|---|---|
| دائرة | فەرمانگە | |
| دائرة الرزم | بەستەخانە | |
| دائرة (هندسیة) | جوغز | دەگوترێت : جوغزی کێشا . |
| داخلی | ناوەکی | بڕوانە : « خارجی » . |
| داخلیة | ناوخۆ | |
| دار الایتام | سێویخانە | لە بادینان بە مندالی بێ دایك و باوك دەگوترێت ( سێوی ) . |
| دار العجزة | کەترەخانە | (کەترە) بەو کەسە دەگوترێت کە بە جارێك بەلاکەوتەو کەفتەکار بێت . |
| دار المجاذیب | شێتخانە | |
| دار المعلمین الابتدائیة | ئامۆژگای فێرکاران | بڕوانە : « معلم » . |
| دار المعلمین الریفیة | ئامۆژگای لادێ | |
| دار المعلمین العالیة | ئامۆژگای دەرسکاران | بڕوانە : « مدرس » . |
| دار النقاهة | بوژانگە | واتە جێگەی بوژانەوە ؛ بڕوانە : « مصح » . |

| | | |
|---|---|---|
| دار الوثائق | نامەخانە | واتە ( جێگەی نامە ) نەك ( جێگەی کتێب ) ؛ بڕوانە : « مكتبة » . |
| دار الولادة | زانگە | لە زۆر ناوچە وشەی ( زایین ) بۆ ئینسانیش بەکار دەهێنرێت ؛ لە کتێبی فیزگەکانیشدا بۆ ئینسان بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ٧٠ ) ؛ (نەزۆك ) بە مانای « عقیم » بۆ مرۆڤ بەکار دەهێنرێت . |
| دایـە | نـەمام | |
| دخـل | داهات | |
| ـ الدخل السنوی | داهاتی سالانـە | |
| ـ الدخل الیومی | داهاتی رۆژانـە | |
| درب ( لأصحاب الحرف ) | گوزەر | دەمێکە بەکار دەهێنرێت ؛ دگوەترێت : گوزەری ئاسنگەران ؛ بڕوانە : « زقاق » ، « شارع رئیسی » ، « شارع فرعی » ، « طریق » ، « الطریق الدارس » ، « الطریق الرئیسي » . |
| درجـة | نومرە | |
| ـ درجة المکملین | دوا نومرە | |
| ـ الدرجة النهائیة | نومرەی کۆتایی | |
| درجة (للحرارة) | پـلە | |
| ـ درجة الحرارة | پلەی گەرما | |

| | | |
|---|---|---|
| درجة (للوظيفة أو المركز) | پایە | |
| درس | دەرس | زۆر دەمێکە بەکار دەهێنرێت؛ بەکار هێنانی (دەرز) هەڵەیە چونکە لە زۆر شوێنی کوردستان لەبریتی (درز) بەکار دەهێنرێت. |
| ـ درس الحساب | ژمارە | |
| ـ درس الرسم | دەرسی نیگار | بڕوانە: «المرسم». |
| دفاع | بەرگری | دەڵێن: بەرگرییەکی زۆریان کرد... لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان زاراو بەکار هێنراوە («پەروەردەو زانست»، ل ١٩٥). |
| ـ الدفاع المدني | بەرگریی میللی | |
| دفتر | دەفتەر | |
| دفتر الاستاذ | سەردەفتەر | شەوان تا وەڕۆ<br>پیشەم ناڵانن<br>سینەم سەردەفتەر<br>کوڵ خەیاڵانن<br>فۆلکلۆری کوردی |
| دفتر الخدمة | خزمەتنامە | |
| دفتر النفوس | سەرنامە، خۆنامە | |
| دقیقە | وردەك | |
| دلیل (الطریق) | ڕێبەر | |
| دلیل (لتوضیح أو إثبات الشیء) | بەڵگە | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە («پەروەردەو زانست»، ل ٤٨)؛ بڕوانە: «مستمسك». |

| | | |
|---|---|---|
| دمج ( كيمياء ) | لێكدان | بڕوانە : « إحتكاك » . |
| دور | نـۆرە | |
| ـ الدور الأول | نۆردی یەكەم | |
| ـ الدور الثانی | نۆرەی دوەهەم | |
| الدور والتسلیم | دانستان | لە ( دان ) وە ( ستاندن ) ەوە وەرگیراوە ؛ بڕوانە : « مباشرة » . |
| دورە | خول ، سوڕ | لە كتێبی فیزگەكاندا ( خول ) بەكار هێنراوە (« پەروەردەو زانست » ، ل ١٧٧ ) ؛ دەتوانین بڵێین : ( خول ) یا ( سوڕ )ی یەكەم ... |
| دولة | كیشوەر | |

## ـ ذ ـ

| | |
|---|---|
| الذاتیة | فەرمانبەری |
| ـ ذاتیة الأساتذة | فەرمانبەری ماموستایان |
| ذخیرە | ئازوقە |
| ذریة | نەوە |
| ذكری | یاد |

## ـ ر ـ

| | |
|---|---|
| رابطة | پەیوەستی |
| راتب | مووچە |

| | | |
|---|---|---|
| راتب اسبوعي | هەفتـانە | |
| راتب سنوي | ساڵانە | |
| راتب شهري | مانـگانە | |
| راسب (ساقط) | کەوتـوو | |
| ـ رسوب | کەوتن | |
| رأسـمال | سـەرمایە | |
| رئاسة الجامعة | سەرۆکایەتی زانکۆ | بڕوانە : « جامعة » . |
| راوح | پێ‌کوتـە | بۆ وەرزش و لەشکر . |
| رئيس العمل | سـەرپاڵە | |
| رئيس الوزراء | سەرەك وەزیر | |
| ربـح | سـوود | « قازاج » تورکییە . |
| ربـط | بەسـتن | |
| رحبة المدخـل (مصطلح هندسي) | داڵان | |
| رحـلة | گـەشت | |
| رحـلة (في الصف) | تەختـە | |
| رخصـة | دەرفەت | |
| رزمـــه | بەسـتە | |
| ـ رزام | بەستەبەند | |

| | | |
|---|---|---|
| رسالة | نامه | |
| ـ رسالة شكر | سوپاسنامه | |
| رسم | نیگار | |
| رسم (كضريبة) | فەرمانە | |
| رسمي | میری | |
| ـ شبه رسمي | سامیری | بڕوانە : « شبه رسمی » . |
| رشوة | بەرتیل | |
| رصاص | مز | |
| رصيد (رصيدمالى) | پشتیوانە ، مایە | بڕوانە : « إعتماد » |
| رصيف | پێڕەو | بڕوانە : « ممشى » . |
| رعاية | چاودێری ، سایە | بڕوانە : « مراقبة » . |
| رعاية الاحداث | لەلەیتی | |
| رقم | ژمارە | |
| ـ رقم سرى | ژمارەی نهێنتی | |
| رماد | سوتو | |
| رمز | هێما | |
| رياضه | وەرزش | دەمێکە بۆ ئەم مانایە بەکار دەهێنرێت ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٢٩ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ رياضة بدنيه | وەرزشی تەنی | |
| ـ رياضي | وەرزشەوان | له کتێبی فیزیکەکاندا هەمان وشه بەکار هێنراوه ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٢٩ ) . |

## ـ ز ـ

| | | |
|---|---|---|
| زاوية | گۆشه | |
| زقاق | کـوچه | : By-road , by-way بڕوانه : « درب » ، « شـارع رئيسى » ، « شـارع فرعى » ، «طريق» ، « الطريق الدارس » ، « الطريق الرئيسي » . |
| زمـالة ( زمالة في العمل ) | هاوکاری | |
| ـ زميـل ( في العمـل او الاختصاص ) | هاوکار | بەرامبەر بە « Colleague » ی ئینگلیزی . |
| زنزانه | زیندان | بڕوانه : « سجن » و « موقف » . |
| زيارة | سەرلێدان | |
| زينه | ئارایشت | تا سولەیمانان نەبوونە صدوری تەختی ئاخیرەت ، ئەحمەدی موختاری ئێمه شاهی تەخت ئارا نەبوو ـ نالی ؛ بڕوانه : « تزيين » . |

## - س -

| | | |
|---|---|---|
| سائق | ئاژیار | لەولای ( زێ )وە بە سۆران و کرمانجەوە لە بریتی ( اژخوژین ) ( ئاژۆتن ) بەکار دەهێنن ؛ کوردی ئەو ناوچانە دەڵێن : باژۆ ( وەك : کەرەکە باژۆ ... ) ، ئاژۆتمان ، ئاژۆتیان ، دەئاژوێ ... ؛ (ئاژیار) « قیاس » لەسەر : جوتیار ، فرۆشیار ، بەختیار ، هەستیار... |
| سابقة | رابردە | لە ( رابوردو )ەوە وەرگیراوە ؛ دەگوترێت : رابوردوی زۆرە ... |
| ساحل | رۆخ | |
| ساحة | مەیدان | لە سۆران باوە ؛ « مەیدانی چوار چرا » ـ مەهاباد . |
| ـ ساحة القتال | مەیدانی شەڕ | |
| ساعة | سەعات | |
| ساقط | کەوتو | بزوانە : « راسب » . |
| ساند ( مسند ) | دیرەك | |
| سایلو | کەندو | |
| سباق | ملە | لە لادێ باوە ؛ دەگوترێت : ملەی لەلەڵ دەکات ، با ملانێ بکەین ، ولاغەکەی ملەی کردو پێش هەموان کەوت ، ملە دەکات ... |
| سبورە | دەپ | ( دەپ ) بە کرمانجی (تەختە) یە . |

| | | |
|---|---|---|
| سجل | تۆمار | |
| ـ سجل الأحوال المدنية | تۆماری باری شارستانەتی | |
| ـ سجل قيد الطلاب اليومي | تۆماری رۆژانەی ناوی شاگردان | |
| سجن | بەندیخانە | بڕوانە : « زنزانە » و « موقف ». |
| ـ سجين | بەند | بڕوانە : « محبوس » . |
| سحب اليد | دەست کێشانەوە | |
| سداد | پشك | لە لادێ ئەگەر مەشکە کون بێ چیلکەیەکی پێدا دەکەنو دەڵێن : پشکی کرد . |
| سری | نهێنی | لە ( نهانی ) یەوە هاتوە . |
| سرية | لق | بۆ سوپا . |
| سطح | روو | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە (« پەروەردەو زانست » ، ل ٢٣ ، ٨٥ ) . |
| سعر | نرخ | |
| ـ سعر الجملة | کۆبایی | |
| ـ سعر المفرد | تاك بایی | |
| سفارة | باڵیۆزخانە | بەهەڵە لە هەندێك ناوچە دەگوترێت ( باڵوێز ) و ( باڵوێزخانە ) . |
| ـ سفير | باڵیۆز | |

| | | |
|---|---|---|
| سفر | ڕێبواری | |
| ـ مسافر | ڕێبوار | |
| سفينه | کەشتی | دەمێکە بەکار دەهێنرێت ( بڕوانە : « أسمدی » ، ل ٥ ) . |
| السعی السنوی | نومرەی ساڵانە | |
| سکرتیر | سکرتێر | |
| ـ السکرتیر العام | سکرتێری گشتی | بڕوانە : « الامین العام » . |
| السلامة الشخصیة | ئێریایتی تەن | لە بادینان ( ئێریا ) « سالم » و ( ئێریایتی ) سەلامەتە ؛ بڕوانە : « الحمایة الشخصیة » . |
| سلسلة | زنجیرە | دەتوانین بڵێین : زنجیرەی یەکەم ، زنجیرەی ژمارە دوو ...؛ بڕوانە : « تسلسل » . |
| سلسلة ( قید ) | زنجیر | « عنب » ترێ « تین » هەنجیرە « قیدو سلسله » زنجیرە ( « أحدی » ، ل ٦ ) . |
| سلطة | دەسەڵات | |
| سلفة | پێشینە | |
| سلوك | ڕەوشت | دوور نییە لە ( ڕۆیشتن ) ەوە هاتبێت ؛ « ڕەفتار » وشەیەکی فارسی زۆر باوە . |
| ـ سیء السلوك | بەدڕەوشت | بڕوانە : « حسن السلوك » . |
| سماد | پەین | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ٥٥ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| سماعی | دەماودەم | دەگوترێت : دەماودەم بلاْو بۆوە |
| سمو | باڵا | |
| سند | قەواڵە | وشـەیەکی کوردی پەتییەو ئەو واتـایە دەگەیێتەوە ، دەگوترێت : تا ڕێوی قەواڵەی خۆی خوێندەوە پێستیان کەند ، کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە ... ؛ لە هەندێك ناوچە دەڵێن : قەباڵە . |
| سنة | ساڵ | |
| ـ سنة التوجیه | ساڵی ئاراستەکردن | |
| ـ السنة التوجیهیة | ساڵی ئاراستەیی | |
| سهل | ئاسان | |
| ـ تسهیل | ئاسانکردن | بڕوانە : « تسهیل » . |
| سهم | پشك | بڕوانە : « حصة » . |
| سیاج | پەرژین ، چیلە | |
| سیاحة | گەشت | |
| ـ سائح | گەشتەوەر | قیاس لەسەر : بەختەوەر ... |
| سیء الطبع | بەدخوو | |
| سید | کاك | تەنها وەك « لقب » : کاك شیروان ؛ بۆ « سیدانی وسادنی » وا باشە هەروەك ئێستا باوە بهێنرێتەوە ، واتە : ( خوشاك و براپان ) |

| | | |
|---|---|---|
| سيدة | خانم | بڕوانە : « آنسە ». |
| سيرة | ژینامە | واتە نامەی ژین یا ژیان . |

## - ش -

| | | |
|---|---|---|
| شارع رئيسی | شەقام | بڕوانە : « درب » ، « زقاق » ، « شارع فرعی » ، طريق » ، « الطريق المدارس » ، « الطريق الرئيسی » . |
| شارع فرعی | کۆڵان | Bystreet ؛ بڕوانە : « درب » ، « زقاق » ، « الطريق المدارس » ، « الطريق الرئيسی » . |
| شاطیء | ڕۆخ | |
| شاعر | هۆنەر | |
| ـ شاعر شعبی | شایەر | |
| شاغر | چۆڵ | |
| شاهد | شایەد | |
| ـ شهادة | شایەدی | دەگوترێت : شایەدی دا ... |
| شبه جملە | سازستە | بڕوانە : « جملة » . |
| شبه رسمی | سامیرتی | بڕوانە : « رسمي » ؛ ( سا ) بە مانای ( وەکو ) و « شبيه » دێت؛ دەڵێن : ئەو ئاشە سادۆڵە ، واتە وەك دۆڵ وایە چونکە ( ئاشی سادۆڵ ) بەو ئاشە دەگوترێت کە== |

= بۆ ئەندۆرو پوسکە بە ئاوێکی زۆر (بۆ تەنگ هێنانەوە) دەگەزێت .

| | | |
|---|---|---|
| شتل | شەتڵ | |
| شدة | توندی | |
| شرح (مصدر) | ڕاڤین | |
| ـ شارح | ڕاڤەر | دەتوانین بڵێین : من ڕاڤەری ئەو کتێبەم ... |
| ـ شرح (اسم المصدر) | ڕاڤە | بڕوانە : « تفسیر » . |
| شرط | مەرج | |
| شرق | ڕۆژهەڵات | |
| ـ الشرق الأدنی | ڕۆژهەڵاتی نزیك | |
| ـ الشرق الأقصی | ڕۆژهەڵاتی دوور | |
| ـ الشرق الأوسط | ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست | |
| شركة | بەشگە | لە کتێبی فێرگەکاندا (بەشدارگە) بەکار هێنراوە (« پەروەردەو زانست » ، ل ١١) . |
| الشریان التاجی | شادەمار | شێخ ڕەزا دەڵێت : شادەماری ستە نابزوێ ڕەگی قاچو قولی... |
| شریك | هاوبشك | دەگوترێت : بشکی هەیە لەو خانووەدا ... ؛ بڕوانە « حصة » و « سهم » . |

| | | |
|---|---|---|
| شطب | سڕینەوە | |
| شعار | دروشم | هەر خاوەن مەڕو ماڵاتێك داغێكی تایبەتی خۆی هەیە بۆ نیشانە كردنی مەڕو بزنی خۆیو جیا كردنەوەیان لەوانی تر ، بەمە دەگوترێت ( دروشم ) . |
| شعبه | پەل | |
| شعبة المحاسبة | دەفتەرداری | بڕوانە : « محاسب » و « المحاسبة » و « كاتب الحسابات » . |
| شفهي | زارەكی | |
| شكر | سوپاس | |
| ـ رسالة شكر | سوپاسنامە | |
| شمال | باكور | پیرەمێرد لە شیعری خۆیدا بەكاری هێناوە ؛ لە كتێبی فێرگەندا هەمان وشە بەكار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٢ ) ؛ بڕوانە : « جنوب » . |
| شكاية | گازن | بە كرمانجی دەڵێن : گلەیو گازن ...؛ كوردی سۆڤیێت هەمان وشە بەكار دەهێنن ( Q. Kurdo, ... L 270 )؛ دەتوانین بڵێین : گازنی كرد...؛ ( گازندە ) ش بەكار دەهێنرێت . |
| شهادة الجنسية | زێدنامە | بڕوانە : « جنسية » |
| شهادة ( دراسيه ) | فێرنامە | كورت كراوەی ( فێربوون نامە )یە . |
| ـ شهادة جامعية | فێرنامەی زانكۆیی | بڕوانە : « جامعة » . |

| | | |
|---|---|---|
| شهر | هەیڤ | لە ناوچەی بادینان بۆ « شهر » و بـۆ « قمر » بەکار دەهێنرێت ؛ بڕوانە : « قمر » . |
| شوط | کایە | لە ناو منداڵاندا باوە ؛ دەتوانین بڵێین : کایـەی یـەکەم ، واتـە « الشوط الأول » ... |
| ـ الشوط النهائي | دوا کایە | |

# ـ ص ـ

| | | |
|---|---|---|
| صاحب العمل | خاوەنکار | |
| صادرات | هەناردراو | بڕوانە : « تصدير » و « مصدره » و « استيراد » و « مستورده » . |
| صادرة ( الكتب الرسمية ) | ناردۆ | پێچەوانەکەی : هاتـوو ؛ بڕوانە : « وارده » . |
| صانـع | شـاگرد | بڕوانە : « طالب » . |
| صحافة | ڕۆژنامەگەری | |
| صحة البدن | تەندروستی | |
| صداق | مارەیی | |
| صرف ( تبديل صك أو عملة بعملة ) | گۆڕینەوە | |
| صعب | سەخت | |
| صف | پۆل | دەمێکە بەکار دەهێنرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| صفر | سفر | |
| صفـة ( مصطلـح لغوي ) | ئـاوەڵناو | لەکتێبی فێرگەکاندا هەمان وشـە بـەکار هێـنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٦٨ ) . |
| صك | چەك | |
| صلاحية | دەسـەڵات | |
| صلح | ئاشتی | |
| صمغ | سرێش | |
| صنف | بابەت | |
| ـ تصنيف | بابەت کردن | |
| صورة | وێنە | نەك تەنها بە مانای « رسـم » ؛ دەتوانین بڵێین : وێنەیەکی بۆ ... واتە « صورة منه الى » . |
| صياغة | داڕشتن | بۆ نوسـین ؛ دەتوانین بڵـێین : داڕشتنی نوسینەکەی بەهێزە ... |
| صيدلية | دەرمانخانە | |

## ـ ض ـ

| | |
|---|---|
| ضـائع | فەوتـاو |
| ـ الأموال الضائعة | ماڵی فەوتاو |
| ضـابط | ئەفسەر |
| ـ ضابط الارتباط | ئەفسەری پەیوەندی |

| | | |
|---|---|---|
| ـ ضابط التجنيد | ئەفسەری سەربازگرتن | بڕوانە : « تجنيد » . |
| ـ ضابط السفر | ئەفسەری ڕێبوارتی | بڕوانە : « سفر » . |
| ضامن (كـفيل) | كەفيـل | |
| ضبـط (الافادات او المحاضر) | نوسـينەوە | |
| ضبط ( انضباط ) | دابين كردن | |
| ـ لجنة الضبط | ليژنەی دابينتی | |
| ضـد | دژ | |
| ضريبـة | باج | لە دەمێكەوە باوە . |
| ـ ضريبة الارض | زەويانە | |
| ـ ضريبة الدخل | داهاتانە | |
| ـ ضريبة الدفاع الوطني | بەرگرانە | |
| ـ ضريبة الرأس | سـەرانە | بڕوانە : « جزية » . |
| ـ ضريبة الرعي | پوشـانە | |
| ـ ضريبة العقار | مالآنە | |
| ضمـير ( مصطلح لغوي ) | رانـاو | |

## ـ ط ـ

| | |
|---|---|
| طائـر | مـەل |
| طابع ( بريدي ) | پـوول |

| | | |
|---|---|---|
| طابعة | تیپنووس | له « Type » ەوە وەرگیراوە کە بە مانای رێك و « نموذجی »ش دێت ، بەو جۆرە ( تیپنووس ) دەبێت بەو ئالەتەی بە رێکی دەنووسێت ؛ « Typewriter » ی ئینگلیزیش هەمان واتا دەبەخشێ . |
| ـ كاتب الطابعة | تیپکار | |
| طابق | نهۆم | |
| طابو | تاپۆ | |
| ـ دائرة الطابو | فەرمانگەی تاپۆ | |
| ـ مديرية الطابو | کارگێڕی تاپۆ | |
| طارمه | هەیوان | Veranda |
| طاقة | وزە | بەرامبەر بە « Energy » ؛ لە ( وەزە ) وە هاتووە ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٦٥ ) . |
| طالب | خوێندکار | بۆ دوای فێرگەی سەرەتایی ؛ ( خوێندکار ) « طالب العلم » دەگرێتەوە ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٤٧ ). |
| ـ طالب خارجي | خوێندکاری دەرەکی | |
| طباع | چاپکەر | |

| | | |
|---|---|---|
| طبع | چاپ کردن | |
| طبق الاصل | دەق | دەگوترێت : دەق وەك ئەو وایە ... |
| - صورة طبق الاصل | وێنەی دەق | |
| طبقة | چین | وەك زاراوێکی کۆمەلایەتی . |
| طبقة (کمصطلح جغرافي) | پات | |
| طبیب | پزیشك | واتا دەبژێنێتەوە یا دەبێتە هۆی ژیانەوەی ؛ لە جزیرو بۆتان و شوێنی تر ( پزیشك ) بەکار دەهێنن ، دەلێن : ئەز پزیشکێ چاڤامە ... ؛ « پزیشك » فارسییە . |
| طرد ( بریدي ) | بەستە | بڕوانە : رزمە . |
| طرد ( من العمل ) | دەرکردن | |
| طریق | ڕێ | بڕوانە : « درب » « زقاق » ، « شارع رئیسی » ، « شارع فرعي » . |
| - الطریق الدارس | کوێرە ڕێ | بەو ڕێگەیە دەگوترێت کە لە دەشت و بیاباندا شوێنەواری نەمابێت؛ دەلێن : ڕێی نێوان کەرکوك و کفری کوێر بۆتەوە . . . |
| - الطریق الرئیسي | شاڕێ | Highway |
| طریقة | ڕێباز | |
| طقس | کەش | لە زۆر ناوچە باوە ؛ دەلێن : ئەمڕۆ کەش چۆنە ؟ ... |

| | | |
|---|---|---|
| طلب | داوا | دەتوانین بڵێین : داوایەکی پێشکەش کرد ... |
| طوارئ | ناکاو | |
| طول | درێژایی | بڕوانە : « إرتفاع » ، « حجم » ، « عرض » ، « قاعدة » ، « مركز » و « مساحة » . |
| طين صناعي | قوڕی دەستکرد | |

## - ظ -

| | | |
|---|---|---|
| ظرف ( وضع ) | بار | دەگوترێت : باری ئەمڕۆی جیهان باشە ... |
| ظرف ( للرسالة ) | پاکەت | |
| ظلم | زۆرداری | |
| - ظالم | زۆردار | |

## - ع -

| | | |
|---|---|---|
| عاجز | بێکارە | |
| عادل | دادگەر | دەتوانین بڵێین : پادشایەکی دادگەرە ؛ بڕوانە : « حاكم » و « محكمة » . |
| عادة | خو | |
| عاصمة | پاتەخت | لە هەندێك ناوچەی کوردستان دەگوترێت ( پایتەخت ) ، لە هەندێکی تریشیان ( پاتەخت ) ، بەلاّم لە فارسیدا تەنها (پایتەخت) هەیە بۆیەکا هەڵبژاردنی (پاتەخت) وەك زاراو پارسەنگە . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ امانه العاصمة | پاتەختەوانێتی | |
| ـ امين العاصمة | پاتەختەوان | |
| عاطـل | بێـکار | |
| عاقبة | سەرەنجام | سەرەنجامی گـا هەر دزێنە . پەندی پێشنیان |
| عامـل | کرێـکار | |
| عامل ( والي ) | کاردار | |
| عـبره | پەند | بڕوانە : « عضه » . |
| عتـاد ( ذخيرة عسكرية ) | جبەخانە | دەگـوترێت : چەك و جبەخانە ... |
| عدد ( العدد ) | ژمارە | |
| عدم محكومية | بێتاوانی | |
| عُرض | پانایـتی | بڕوانە : « ارتفاع » ، « حجم » ، « طول » ، « قاعدة » ، « مركز » و « مساحة » . |
| عرق ( عنصر ) | رەگـەز | |
| عرقـلة | تەگـەرە | |
| عريضه | ئەرزوحاڵ | |
| عـزل | لێخستن | لێخرا ، واتا « عزل » كرا . |
| عسكری | سوپایتی | بڕوانە : « قضائی » و « مدنی » . |
| عضة | پەند | بڕوانە : « عبرة » و « واعظ » . |

| | | |
|---|---|---|
| عضــو | ئـەندام | |
| ـ عضو شرف | ئەندامی شەرەف | |
| ـ العضو العامل | ئەندامی کارا | |
| ـ العضو المؤازر | ئەندامی یاریدەر | (یاریدەر) راستەو لەسەر زمانو بەگوێ لە (یاریدەدەر) ئاسانترە . |
| عطـلة | پشــوو | |
| ـ عطلة رأس السنة | پشووی سەری ساڵ | |
| ـ العطلة الربيعية | پشووی بەهار | |
| ـ العطلة الصيفية | پشووی هاوین | |
| ـ عطلة نصف السنة | پشووی نیوەی ساڵ | |
| عقاب | سـزا | |
| عقــار | زەویزار | لە (زەویو زار) ەوە وەرگیراوە کە لە هەندێك ناوچە بەو جۆرە کورت کراوەتەوە ؛ وەك : لالەزار کە (لالەوزار) ە ... |
| عقد (تعهد) | پەیوەند | دەتوانین بڵێین : پەیوەندێکیان بەست ... |
| ـ عقد العمل | پەیوەندی کار | |
| عقد النكاح | مارەبڕین | |
| عقيــدة | باوەڕ | |
| عقيم | نەزۆك | بڕوانە : « دار الولادة » . |
| علاج | چار ، چارەسەر | دەگوترێت : چاری دەردم بکە ... |

| | | |
|---|---|---|
| علاقـة | پەیوەندی | |
| علامة | نیشانە | |
| ـ علامـة الاستفهام | پرسەك | قیاس لەسەر (کوتەك) کە ئەمرازی کوتانە . |
| ـ علامة التعجب | سەیرەك | وەك (کوتەك) و (پرسەك) ... |
| علاوة ( راتب ) | سەرموچە | |
| علبــه | قـوتـو | |
| علــو | بەرزایی | بڕوانە : « ارتفاع » ، « حجم » ، « طول » ، « عرض » ، «قاعدة» ، « مركز » و « مساحة » . |
| عمــل | کار | |
| ـ عمل اليــد | کاری دەست | |
| عمل شعبي | گەلـکاری | |
| عمــلي | کردەنی | دەگوترێت : کاری کردەنی نییە . |
| عمـود | ســتون | Vertical ؛ لە کتێبی فیزیکەکاندا هـەمان وشـە بەکار هێنراوە (« پەروەردەو زانست » ، ل ٢٨). |
| ـ عمودی | ســتونی | Verticality |
| العمود الفقری | بڕبڕە | بڕوانە : « فقرة ـ عظام » . |
| عمید | راگر | |
| عنصر ( عرق ) | رەگەز | بڕوانە : « عرق » . |
| ـ عنصری | رەگەزپەرست | |

| عنوان | ناو نیشان | |
|---|---|---|
| عوض | تۆڵە | لە لادێ دەڵێن : تۆڵەی پێ دا ، زەرەرت زۆر کردوە تۆڵەت بۆ ئەکەمەوە ... ؛ بڕوانە : «تعویض». |
| عیب ( نقص ) | عەیب | دەگوترێت : ئەم کارە یا ئەم خانوە عەیبدارە ... |
| عيني |ماڵینە | دەڵێن : ماڵت دەوێ دەتدەمێ ، پارەت دەوێ دەتدەمێ ... ؛ بڕوانە : « نقدی » . |

## - غ -

| | | |
|---|---|---|
| غامض | لێڵ | |
| غبن ( فی الوظائف أو المعاملات ) | تێشکان ، بەشخوران | |
| غرامة | تاوانە | لە موکریان بەکار دەهێنرێت ؛ ( تاوانە ) واتە ( حەقی تاوان ) ؛ کورت کراوەی ( تاوانانە ) یە . |
| غائب | پیوار | لە هەورامان باوە ؛<br>خوا داد لە دەست مامڵەی فەلەک<br>خستی وە پیوار چەرمۆی چاو بەڵەک<br>فولکلۆری کوردی |
| غالي ( للسعر ) | گران | |
| غرب | ڕۆژئاوا | |
| غرفة التجارة | ژوورێ بازرگانێ | |

| | | |
|---|---|---|
| غش | خەوش ، گزی | دەگوترێت : زێڕی بێ خەوشە... |
| غير أصيل | ناڕەسەن | بڕوانە : « أصيل » . |
| غير متغير | نەگۆڕاو | بڕوانە : « متغير » . |

## - ف -

| | | |
|---|---|---|
| فائدە ( مادية ومعنوية ) | سود | |
| فارزە | وێرگول | |
| فارغ | ڤالا ، بۆش | ( ڤالا ) لە کرمانجیدا باوە ، بڕوانە : î. O. Farïzov , Ferhenga ùrisî - kurmancî, Moskva, 1957, L. 555 - 6 ( لەمەو دوا : Farîzov ... ) Q. Kurdo ..., L. 773 . |
| فحص | نۆڕین | ( نۆڕین ) لە ( ڕوانین ) ئاسانترە؛ بڕوانە : « کشف » . |
| - فحص طبي | نۆڕینی پزیشکی | بڕوانە : « طبيب » . |
| فراش | بەردەست | |
| فرصة | دەلیڤە | لە بادینان باوە ، دەڵێن : من دەلیڤە نەدیت دەرکەڤم یان بێژم... |
| فرع | لك | لە لکە دارەوە وەرگیراوە ؛ تەنها لە چەند ناوچەیەکی کەمی کوردستان پیتی ( ك ) ی ئەم وشەیە بووە بە ( ق ) . |

| | | |
|---|---|---|
| فرقه | لەشکر | |
| فرقه ( رياضية ) | تیپ | بڕوانە : « لواء » . |
| ـ فرقة الاشبال او الطلائع | تیپی پێشەنگان | |
| فصل ( الكتاب ) | پار | مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بەرامبەر ( پار ) لەگەڵ چەند وشەیەکی تردا « Part » و « Chapter » یشیان داناوە(T Wahby ..., P. 102)؛ بەکرمانجیش ( پار ) مانای ( بەش )ە ( بڕوانە : جگەرخوێن، فەرهەنگا کوردی ، بغداد ، ١٩٦٢ ، ل ١٤١ . لەمەودوا : جگەرخوێن ... ) . |
| فصل ( السنة ) | کژ | لە هەندێك لە کتێبی فێرگەکاندا (کەش)و لە هەندێکی تریاندا (وەرز) بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٠٦ ، ١٢٩ ) ؛ دەتوانین بڵێین : کژی هاوین . |
| ـ الفصول الاربعة | چوارکژە | ( چوار کژە ) وەك : دۆمانگە ، چوار مانگە ... |
| فصيل | پەل | بۆ سوپا . |
| فضلات | پاشەڕۆك | بە دوا بەری میوە دەگوترێت ( پاشەڕۆك ) واتە «الجني الاخير» ؛ بڕوانە : « بقايا » . |
| فقرة ( عظم ) | بڕ | |
| ـ العمود الفقري | بڕبڕە | |

| | | |
|---|---|---|
| فقرة ( الکتاب ) | بڕ | ( بڕ ) بە واتای بەش ، دەگوترێت : دوو بڕ دار ... ؛ دەتوانین بڵێین : بڕی یەکەمی ئەم کتێبە ... |
| فُلك | کەشتی | بڕوانە : « سفینە » . |
| فن | تەکنیك | بەرامبەر بە « Technic » . |
| ـ فنی (خبیر فنی) | تەکنیکار | بەرامبەر بە « Technical, technician, technicist » ؛ خۆی ( تەکنیك‌کار )ەو دوو ( ك ) ە « إدغام » کراون . |
| ـ فنی | تەکنیکی | وەك بڵێین : ئەمە کارێکی تەکنیکییە . |
| فن | هونەر | بەرامبەر بە « Art » . |
| ـ فنان | هونەرمەند | |
| فهرست | فێرست ، پێڕست | |
| فوق العادە | سەرئاسا | |

## ـ ق ـ

| | | |
|---|---|---|
| قائد | فەرماندە | |
| ـ قائد الجند | فەرماندەی سەرباز | |
| ـ قائد الجیش | فەرماندەی سوپا | |
| ـ قائد الفرقة | فەرماندەی لەشکر | |
| قائد القوات المسلحة | سوپاسالار | لە سەردەمی شێخ مەحموددا بەکار دەهێنرا ... |

| | | |
|---|---|---|
| قائـــم باعمال | کارگوزار | جاران دەلـونرا : فـلانە کەس کارگوزاری «والی»یە ... |
| قائمقام | هەرێمدار | وەك : کاردار ، فەرماندار...؛ کۆن ( شـاردار ) بەکار دەهێـنرا ؛ بڕوانە : « قضاء » . |
| قائمة | سیایێ | لە موکریان زۆر باوە ؛ لە سەردەمی مـەهـاباددا وەك زاراو بـەکار هێنراوە ؛ لە ئەردەلان ( سیاهە ) بەکار دەهێنن . |
| ـ قائمة الجرد | ســـیایێ بەســەر کردنەوە | |
| ـ قائمة الاخراج | سیایێ دەرهێنان | |
| ـ قائمة الراتب | سیایێ مۆچە | بڕوانە : « راتب » . |
| ـ قائمة السفر | سیایێ سەفەر ، سیایێ رێبواری | مامۆسـتایان تۆفیـق وەهـبیو ئەدمۆنس ( سەفەر )یان بەکار هێناوە ؛ ( T. Wahby ..., p. 126 ) بڕوانە : « سفر » . |
| قابل | شیاو | قیاس لەسەر پـاو ، رۆخاو ... |
| قابل للاحتراق | سۆتەنی | مامۆستایان تۆفیق وەهبیو ئەدمۆنس بۆ هەمان واتـا بەکاریان هێنـاوە . ( T. Wahby ..., p. 134 ) |
| قابلية | توان | بەکار هێنانی ( توانـا ) بەرامبەر « قابلیـة » هەڵەیـە چونکە وەك ( زانا )و ( دانا ) ( ناوی فاعیلی وەسفی )یە ؛ پێویسـتە بڵێین : لە توانمدا نەك لە تواناەمدا نییـە ؛ ( توانا ) « قدیر » و «مقتدر» ە . |
| قاعدة | دەستوور | |

| | | |
|---|---|---|
| قاعدة ( عسكرية او جوية ) | بنكه | له كتێبی فیزیەكاندا هەمان وشه بەكار هێنراوه ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٠ ، ١٤٠ ) . |
| قاعدة ( هندسية ) | بنار | دەگوترێت : بناری شاخ ؛ بڕوانه : « ارتفاع » ، « حجم » ، « طول » « عرض » ، « مركز » ، « مساحة » . |
| قاعة | هۆڵ | له لادێ ( هۆڵـه مەڕ ) بەكار دەهێنرێت ؛ ( هۆڵـه مەڕ ) شوێنێكی سەر گیراوه ئاژەڵی تێ دەكرێت . |
| قانون | یاسا | له سەردەمی تەتارو مەغۆلەوه تێكەڵی زمانی كوردی بووه ، ئەسڵەكەی « یاسون »ه . |
| قبض | سەندن | |
| قرار | بڕیار | له ( بڕین )ەوه هاتوه . |
| قرض | قەرز ، وام | له هەندێك ناوچەی كوردستان دەڵێن ( وا ) بەلام لەگەڵ ( دەست ) دا بەكاری دەهێنن : ( دەستەوا ) ، واته ( دەست قەرز )؛ له شارەزوور دەڵێن : مامـه مامـه دنیا دەستەوامه . |
| قرعة | تیرو پشك | بڕوانه : « حصة » . |
| قسم | بەش | |
| قضاء | هەرێم | وشەیەكی كوردی پەتییه ؛ بڕوانه : «قائمقام» ، «محافظة» و «ناحية» . |
| قضائی | داوەری | بڕوانه : « عسكری » و « مدنی » . |

| | | |
|---|---|---|
| قطب | تەوەر | لە ( تەوەری ئاش ) ەوە وەرگیراوە . |
| قطر | ڕێس | لە فەرهەنگی مەردۆخدا بۆ هەمان واتا بەکار هێنراوە ( بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ٣٠٩ ) . |
| قطع الراتب | مۆچەبڕی | دەتوانین بڵێین : مۆچەبڕی کرا . |
| قطيع | ڕان | وەك : ڕانەمەڕ ؛ بڕوانە : «ماشية». |
| قفص الاسرى | دیلگە | |
| قلب | ناوەنگ | دەتوانین بڵێین : ناوەنگی شەڕ...؛ بڕوانە : « ميسرة » و « ميمنة » |
| القلم السري | جێڕاز | لە (جێگەی ڕاز)ەوە وەرگیراوە . |
| قمر | مانگ | بڕوانە : « شهر » . |
| قناة | نۆکەند | لە کتێبی فیزیکەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٦٣ ) . |
| قوس | کەوانە | لە (کەوان) ەوە وەرگیراوە ؛ (کەوانە)ش بەکار دەهێنرێت ، دەگوترێت : لە کەوانەی ئەو کێوەوە ... |
| ـ قوسين صغيرين | جوت کەوانە | |
| قيادة الجيش | فەرماندارتی سوپا | |
| قياس | پێوان | |
| قياس ( الحجم ) | بارستپێو | بڕوانە : « حجم » . |
| قيد | زنجیر | بڕوانە : « سلسلة » . |

| | | |
|---|---|---|
| قیمـه | نرخ | |
| - قیم | بەنرخ | |

## - ك -

| | | |
|---|---|---|
| کاتب | میرزا | لە کۆنەوە لە ناو کوردەواریـدا بەکار هێنراوە ؛ جاران هـەر ئاغایەك ( میرزا )یەکی هەبـوو کە یەکێك لە مەرجەکانی خەت خۆشی بوو؛ کوردۆیێف بەرامبەر هەمان واتا دایناوە ( Q. Kurdo ..., L 532 ). |
| کاتب الحسابات | دەفتەرگر | بڕوانە: « المحاسب » ، « للمحاسبة » و « شعبة المحاسبة » . |
| کاتب الطابعة | تیپـکار | بڕوانە : « طابعة » . |
| کاتم السر | رازپۆش | |
| کارثـة | کارەسات | |
| کاغد ( ورق ) | کاغەز | |
| کتاب | کتێب | سەدەها ساڵە لەناو کوردا باوەو پێویست ناکات بە وشەی دروست کراوی ناقولای وەك (پەڕتوك) ( پەڕاو ) بگۆڕدرێت . |
| کتاب (رسالة رسمية) | نـــامە | دەتوانین بڵێین : نامەی زەارە... |
| کتابکـم | نامەکەتان | |

| | | |
|---|---|---|
| كتلة (كمصطلح علمي) | كۆما ، قەوارە | لە رۆی زانستەوە لەبەر ئەوەی « كتلە » شتێكی جەماوە (قەوارە) باشترە ؛ بڕوانە : « كيان » . |
| كرة | تۆپ | |
| ـ كرة السلة | باسكە | |
| ـ كرة الطائرة | بالە | |
| ـ كرة القدم | فوتبۆڵێن | |
| كسلان | تەمەڵ ، تەپ | (تەمەڵ) وشەیەكی كوردییە ، لە (تەن بەڵ)ەوە وەرگیراوە ؛ (تەپ) لە زۆر ناوچە بەكار دەهێنرێت . |
| كسوة | پۆشاك | قیاس لەسەر خۆراك ...؛ دەتوانین بڵێین : پۆشاكو خۆراكی ئیمساڵی شاگردان ... |
| كشاف | پێشڕەو ، چاپوك ، چوست | (چاپوك سوار) كە (سوارچاك) دەگرێتەوە لەناو كوردەواریدا باوە ، لێرەدا ماناكەی فراوان كراوە ؛ لە هەندێك ناوچە دەڵێن : (چاپوك) ؛ بڕوانە : « مخيم كشفي » . |
| ـ كشافة | پێشڕەوان ، چاپوكان | |
| كشط (مصطلح هندسي) | كڕاندن | |
| كشف | نۆڕین | دەتوانین بڵێین : چو بۆ نۆڕینی خانۆكان ... ؛ بڕوانە : « فحص ». |

| | | |
|---|---|---|
| كفالة | کەفیلی ، کەفالەت | |
| كفيل | کەفیل | |
| كلام | بێژە | وەك فەرمان ، لە ئەسلدا ( بیێژە ) یە . |
| كلمة | وشە | |
| كلية | زانستگە | وانە ( جێگەی زانست ) ، وەها باوە هەمۆ بەشەکانی هەر «کلیە» یەك لە یەك شوێندا بن وە ئەرازی ( گە )ش مانای شوێن دەگەیێنێت بۆیەکا دانانی ( زانستگە ) بەرامبەر « کلیە » پارسەنگترە وەك لە « جامعة » ؛ بڕوانە : «جامعة» . |
| كمرك | گومرك | |
| كمية | چەندەتی | ( چەندایەتی ) درێژەو شێوازی دارشتنەکەی لە عەرەبییەوە نزیکە ؛ بڕوانە : « کیفیة » . |
| كناس ( زبال ) | پاکەوان | قیاس لەسەر : پاسەوان ، دەرگەوان ، باغەوان ...؛ بڕوانە : « منظف » . |
| كيان ( مصطلح سياسي ) | قەوارە | بڕوانە : « كتلة » . |
| كيفية | چۆنەتی | ( چۆنایەتی ) درێژەو شێوازی دارشتنەکەی لە عەرەبییەوە نزیکە ؛ بڕوانە : « کمیة » . |

## - ل -

| | | |
|---|---|---|
| لائحـة | گەلاڵە | ( گەلاڵە ) بە شتێك یا كارێكی تەواو نەكراو دەگوترێت ، « لائحە »ش پێشنیار كراوو تەواو نەبووە ؛ بڕوانە : « قانون » . |
| - لائحة قانونية | گەلاڵەی یاسا | لە عەرەبیدا « مشروع »یش بەكار دەهێنرێت ؛ بڕوانە : « قانون » . |
| لائق | شیاو | بڕوانە : « لياقە » . |
| لاينو | تیپڕێژ | |
| لجنـة | لیژنە | ( لیژنە ) وشەیەكی كوردیی بەتیبە ؛ دەگوترێت : لیژنە دار ... |
| - لجنة التقدير | لیژنەی نرخاندن | |
| - لجنة الضبط | لیژنەی دابینتی | بڕوانە : « ضبط » . |
| - لجنة النشاط المدرسي | لیژنەی چالاكی فێرگە | بڕوانە : « مدرسة » و « نشاط » . |
| لحظـة | تاو | ( تاو ) بە مانای ( گوزیش ) دێت . |
| لعبـة | یاری | |
| - لعبة كرة السلة | یاریی باسكە | بڕوانە : « كرة السلة » . |
| - لعبة كرة الطائرة | یاریی بالە | بڕوانە : « كرة الطائرة » . |
| - لعبة كرة القدم | یاریی فوتبۆڵێن | بڕوانە : « كرة القدم » . |
| لفـظ | واژە | |
| - لفظي | واژەیی | |

| | | |
|---|---|---|
| لقب | نازناو | وانه ناوێك كه بۆ نازداری دادەنرێت . |
| للعلم | بۆ ئاگاداری | |
| لواء | تیپ | بۆ سوپا ؛ بڕوانه : « فرقه » . |
| لوازم | پێداویست | له هەندێك ناوچه دەڵێن : پێداویستی ئەو كاره چییه هەمووم پەیدا كردوون ... |
| ـ لوازم مدرسية | پێداویستی فێرگه | |
| لیاقه | شیاوێ | بڕوانه : « لائق » . |

## - م -

| | | |
|---|---|---|
| مادة ( شيء ) | مایه | |
| مادة ( موضوع ) | بابەت | |
| ماركه مسجلة | شەقڵ كراو | بەو نیشانانەی لەسەر خەرمان دادەنرێن بۆ ئەوەی نەدزرێت دەگوترێت ( شەقڵ ) . |
| ماشية | گاڕان | بڕوانه : « قطيع » . |
| ماضي | رابوردوو | |
| ماكنة | مەكینه | |
| ماليه | دارایی | |
| مأمور | گزیر | له گوند ( گزیر ) له دوای كوێخاوه دێت و « مأمور تنفيذ » ی ئەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ماهر | کارامه | بەو کەسە دەگوترێت کە لە کارێکدا زۆر شارەزا بێت؛ دەڵێن: ئەم دارتاشە کارامەیە ... |
| مباحثة | لێ دوان، وتووێژ | |
| مبادلة | ئاڵوگۆڕ | |
| مباشرة | دەست پێ کردن | |
| مباشرةً | یەکسەر | |
| مبتدیٔ | نۆکار | لە (نوێ کار)ەوە وەرگیراوە؛ قیاس لەسەر: نۆبەرەو نۆبەند ... [(نۆبەرە) واتە (بەری نوێ)]... |
| مُبلغ | راگەیێن | بڕوانە: «ابلاغ» و «منادی». |
| متابعة | هایکاری | (های) لە کرمانجیدا بە مانای (ئاگا) دێت؛ (هایکاری) واتە ئاگا بوون لەکار ... |
| متأهل | شیاو | بڕوانە: «أهلیة». |
| متجاوب | هاودەنگ | لە هەندێک ناوچە (ئاودەنگ) بەکار دەهێنرێت. |
| متحضر | ژیوەر | بڕوانە: «حضارة». |
| مترسب | نیشتوو | بڕوانە: «ترسب». |
| ـ مرّسب | نیشتوو | |
| متضامن | هاوئەرك | بڕوانە: «تضامن». |
| متعهد (مقاول) | بەڵێندەر، دەستەبەر | بڕوانە: «تعهد». |

| | | |
|---|---|---|
| متغير | گۆڕاو | |
| ـ غير متغير | نەگۆڕاو | |
| متقاعد | خانەنشین | وەك : بۆستنشین ؛ دەڵێن : خانەنشینم ، واتە دانیشتوی ماڵم... |
| متمرد | یاخی ، سەرپێچ | بڕوانە : « تمرد » . |
| متن | سایە | لە حوجرە دەڵێن : قورئانەکەی بە سایە خوێندوە ، واتا بە بۆ خونچەو لێکدانەوەی « متن »ەکەی؛ بەکار هێنانی ( دەق ) کە « طبق الاصل » دەگەیێنێت ، هەڵەیە ؛ بڕوانە : « نص » . |
| متناسب | هاوگر | بڕوانە : « نسبة » . |
| متوازن | هاوسەنگ | |
| مثلث | سێ‌سوچ | |
| مُجاز | وچاندار | قیاس لەسەر : برینـدار ، دوکاندار... ؛ بڕوانە : « اجازة » . |
| مُجاز ( علميا ) | ودمگر | بەو کەسەی « اجازە »ی مار دەدات دەڵێن : ودی هەیە ؛ بڕوانە : « مجيز » . |
| مجال ( كمصطلح علمي ) | مەودا | |
| ـ المجال المغاطيسي | مەودای موقناتیس | |
| مجرم | تاوانبار | بڕوانە : « جريمة » . |
| مجسمة | بەرجەست | لە ( بەرجەستە ) وە وەرگیراوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ الهندسة المجسمة | ئەندازەی بەرجەست | بڕوانە : « هندسە » . |
| مجلس | ئەنجومەن | |
| مجلة | گۆڤار | |
| مجمع | کۆڕ | |
| ـ مجمع العلم | کۆڕی زانیار | |
| ـ المجمع العلمی | کۆڕی زانیاری | لەم بارەیەوە بە درێژی بڕوانە گۆڤاری « زانیاری » ، ژمارە ـ ٤ ـ ، ١٩٧١ ، ل ٥٧ ـ ٧١ . |
| ـ مجمع لغوی | کۆڕی زمان | |
| مجیز | ودمێر | قیاس لەسەر وەرزێر ، جوتێر ... ؛ بڕوانە : « مجاز » . |
| محاسب | دەفتەردار | |
| ـ محاسبة | دەفتەرداری | |
| محاسبة ( إداریة ) | لێپرسینەوە | |
| محافظ | پارێزگار | ( پارێزگار ) بەکار هێنراوە ؛ دەگوترێت : رۆڵە پارێزگارت خوا بێت ... ؛ بڕوانە : «قائمقام» و « مدیر ناحیة » . |
| محافظة | پارێزگە | بڕوانە : « قضاء » و « ناحیة » . |
| محامی | پارێزەر | |
| محبوس | بەند | بڕوانە : « سجن » و « سجین » . |
| محتویات | ناوەرۆك | ... |

| | | |
|---|---|---|
| محسوس | بەرهەست | |
| محطة | ئیستگە | ( ئیست ) مانای ( راوەستان و ویستان )ە ؛ ( ئیستگە ) واتە ( جێگەی راوەستان ) . |
| محفظة | دۆسیە ، فایل | |
| مُحكِم | سەرپشك | دەگوترێت : خۆت سەرپشك بە . |
| محكمة | دادگە | واتە : جێگەی داد ؛ بڕوانە : « حاكم » و « عادل » . |
| ـ محكمة التحقیق | دادگەی تۆژینەوە | |
| محل الاستعارة | خواستنگە | واتە جێگەی خواستن ؛ بڕوانە : « استعارة » . |
| محل الولادە | بوٗنگە | لە ( جێگەی بوٗن ـ لە دایك بوٗن )ەوە داتاشراوە . |
| محو الامیة | نەهێشتنی بێ سەوادی | |
| محیط ( هندسي ) | پەراوێز | |
| مخالفة | سوٗچ | بڕوانە : « جریمة » ، « جنایة » و « جنحة » . |
| مخالفة (التعلیمات) | لاملی ، سەرپێچی | ( لامل ) بەو کەسە دەگوترێت کە بە قسەی کەس ناکات . |
| مختبر | زموٗنگە | واتە ( جێگەی ئەزموٗن ) ؛ بۆ ئاسان کردن ( ئە )ی وشەی ( ئەزموٗن ) لابراوە ؛ هەندێك ( تاقیگە ) بەکار دەهێنن کە ئەسڵەکەی « تحقیق + گە »یە ؛ بڕوانە : «إختبار» و «إمتحان». |

| | | |
|---|---|---|
| مختصر | کورته | بڕوانه : « ملخص » . |
| مخزن الأرزاق | ستێر | له بادینان بەکار دەهێنرێت ؛ له هەندێك ناوچه دەڵێن (ستێرك) . |
| مخزن ( حكومي ) | عەمبار | له زۆر دەمێکەوه باوه ؛ له زاری کرمانجیشدا تا ناو کوردی سۆڤیێت بەکار دەهێنرێت ( Farizov ..., L. 620 ) ؛ ئەسڵەکەی ( ئەمبار )ە کە له ڕێگەی زمانی فارسییەوه چۆته ناو زمانی عەرەبییەوه . |
| مخصصات | دەرماڵه | له هەندێك ناوچه بەو بەشە زیادەیەی یەکێك یا ژمارەیەك له توتنەوانەکان وەری دەگرن دەگوترێت : دەرماڵی . |
| مخمن | خەمڵێنەر | بڕوانه : « تخمين » . |
| مخيم | هۆبە | لەناو کۆچەردا زۆر باوه . |
| ـ مخيم كشفي | هۆبەی پێشڕەوان ، هۆبەی چابوکان | بڕوانه : « کشاف » و « کشافة » . |
| مُدَّخَر | پاشەکەوت | بڕوانه : « إدخار » . |
| مدرس | دەرسکار | واته کارەکەی دەرس وتنەوەیه ؛ وەك ( فێرکار ) ؛ بڕوانه : « درس » و « معلم » . |
| مدرسة | فێرگه | واتا ( جێگەی فێرکردن ) ؛ « قوتابخانه » له « کتابخانه » وە وەرگیراوه ؛ کوردۆییف (فێرگە)ی بەکار هێناوه ( Q.Kurdo ..., L.261 ) بڕوانه : « تلميذ » . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ المدرسة الأبتـدائية | فێرگەی سەرەتایی | |
| ـ المدرســـة المتوسطة | فێرگەی ناوەندی | |
| ـ المدرسة الاعدادية | فێرگەی ئامادەیی | |
| ـ مدرسة الفنون البيتية | فێرگەی کابانی | |
| المدعي العام | دادیار | وانە داواکەری دادە . |
| مدقـق | وردکار | |
| مدنیــــه | شارستانەتی | لە ( شـارستانێتی ) ســۆکترە ؛ بڕوانە : « حضارة » . |
| مدنی | ژیاری | بڕوانە : «عسکری»و «قضائی». |
| مُدَوِّر (کمصطلح مالي) | گەڕاوە | |
| مدون | تۆمارکر | |
| ـ المدون القانونی | تۆمارکری یاسا | بڕوانە :« قانون » . |
| مدیــــر | کارگێڕ | بڕوانە : « الادارة » . |
| مدیر ناحیة | مەڵبەندار | لە ئەسڵدا ( مەڵبەنددار)ە ؛ بڕوانە : « قائمقام » ، « محافــظ » و « ناحیة » . |
| مـدیریە | کارگێڕی | بڕوانە : « إدارة » . |
| ـ مدیریة الادارة | کارگێڕی کارداری | |

| | | |
|---|---|---|
| مدينة | شار | |
| مذكرات | بیرەوەری | |
| مذكرة | پسوولە | |
| مذكور | ناوبراو | |
| مذيع | پەخشەر | بڕوانە : « إذاعة » . |
| مرادف | هاو واتا | وەك : Synonym |
| مراقبة | چاودێری ، چاڤدێری | کوردوێیێڤ بۆهەمان واتای داناوە ( Q. Kurdo ..., L. 153 ) ؛ بڕوانە : « رعاية » . |
| - مراقب | چاودێر ، چاڤدێر | |
| مرحلة | قۆناغ | |
| مرسّب (مترسب) | نیشتوو | بڕوانە : « ترسب » . |
| مرسم | نیگارگە | بۆ هەموو جۆرەکانی « مرسم » . |
| مرشد | رابەر ، رێبەر | دەگوترێت : رێبەری من غەوزی گەیلانییە ؛ بڕوانە : « إرشاد » . |
| مرصد | روانگە | واتە ( جێگەی روانین ) . |
| مرفق (مرفقات) | هاوپێچ | |
| مركز (موءسسة) | بنگە | لە کوردیدا جگە لە ( بنکە ) ( بنگە )ش هەیە کە لە ( بن گاە )وە وەرگیراوە ؛ لە زمانی فارسیدا ( بن گاە ) بۆ « معهد » دانراوە . |

- المركز الاجتماعي بنكەی كۆمەلآيەتی

| | | |
|---|---|---|
| مركز (هندسي) | بنـــه | بەو گايەی لە كاتی گـێرەدا نابزوێ‌و ئەوانی تر بە دەوریـدا دەسوڕێنەوە دەگوترێت : بنە ؛ بڕوانە : « ارتفاع » ، « حجم » ، « طول » ، «عرض» و «مساحە». |
| مركز الثقل | چـەق | |
| مزاد | مەزات | |
| مزايد | زۆرگر | بڕوانە : « مناقص » . |
| - مزايدة | زۆرگرتی | بڕوانە : « مناقصة » . |
| مزرعة | كێڵگە | لە كتێبی فیزگەكاندا هەمان وشە بەكار هێنراوە (« پەروەردو زانست»، ل ١٠٦ ) ؛ بڕوانە : « حقل » . |
| مساعد | یاوەر | |
| مسافر | رێبوار | بڕوانە : « سفر » . |
| مساواة | یەكسانی | |
| مستخدم | خزمەتگوزار | |
| مستدعي | داواكار | |
| مستشار | راوێژكار | بڕوانە : « استشارە » . |
| - مستشير | راوێژخواز | بڕوانە : « استشارة » . |
| مستشفى | خەستەخانە | بڕوانە : « مستشفى الامراض العقلیـة » ، « مستشفى العزل » و « مستوصف » . |

| | | |
|---|---|---|
| - مستشفى الأطفال | خەستەخانەی منداڵان | |
| - مستشفى الأمراض الصدرية | خەستەخانەی سینه | |
| مستشفى الأمراض العقلية | بیمارستان | زۆر جار له شیعردا ( بیمار ) بۆ « عاشق » بەکار هێنراوە . |
| مستشفى العزل | نەخۆشخانه ، کەرەنتینه | |
| مستعار | خوازراو | بڕوانه : «استعارة» ، «مستعير» ، « معار » و « معير » . |
| مستعجل | خێرا | |
| مستعير | خوازەر | بڕوانه : «استعارة» ، «مستعار» ، « معار » و « معير » . |
| مُستَغَلْ | دەرهاتوو | |
| مستمسك (دليل) | بەڵگه | بڕوانه : « دليل » . |
| مستمع | گوێگر | |
| مستند | پاڵگه | |
| مُستَهْلَك | تێچوو | بڕوانه : « استهلاك » . |
| مُستهلِكْ | تێبەر | بڕوانه : « استهلاك » . |
| مستورده (أموال) | هاورده | بڕوانه : « استيراد » و «مصدرة». |
| مستوصف | تیمارگه | بڕوانه : « مستشفى » . |

| | | |
|---|---|---|
| مستوى | رێکار | وەك « Level » ؛ بۆ هەمـوو واتـاکانی ؛ دەگوترێـت : لە رێـکی یەکن ، واتە لە یەك «مستوى» دان ؛ قیاس لەسەر : ئێـوار ، کردار ، رۆکار ، بنار ، روخسار ... |
| ـ مستوى الذكاء | رێکاری زیرەکتی | |
| ـ مستوى الماء | رێکاری ئاو | |
| ـ مستوى المعيشه | رێکاری گوزەران | |
| ـ مستوى النهر | رێکاری زێ | |
| مُستـجَـلْ | تۆمارکراو | |
| مُسَجِـل (مدون) | تۆمارکار | بەرامبەر بە Recorder ؛ واتە ئەو کەسەی کاری تۆمار کردنە . |
| ـ المسجل العام | تۆمارکاری گشتی | |
| مسـح | رووپێوکردن | |
| ـ مساح | پێوەر | |
| ـ مساحة | رووپێو | لە (رووپێو کردن)ەوە وەرگیراوە؛ دەتوانین بڵێین : رووپێوی ئـەم زەوییە ، رووپێوی ئەو خانووە... |
| مـداد | پشـك | کە مەشکە کون دەبێت بە چیلکەیەك کونەکە دەئاخنن ، بەوە دەڵێن : پشکی کرد ... |
| مسرح | شانۆ | دەمێکە ئەم وشـە فەرەنسییە لە زمانی کوردیشدا بەکار دەهێنرێت . |
| مسؤول | بەرپرس | لە هەندێك ناوچە دەڵێن : ئـەو کارە مەکە با بەرپرس نەبێت ... |

| | | |
|---|---|---|
| - مسؤولية | بەرپرستی | |
| مشاوره | راوێژ | بڕوانە : « مشورة » . |
| مشتکی | دادخواز | مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بۆ هەمان واتـا بەکاریان هێناوە (T. Wahby ..., pp. 31-32) |
| مشرف | سەرکار | |
| - المشرف الرياضي | سـەرکاری وەرزش یان وەرزین | |
| - المشرف الزراعي | سـەرکاری کشتوکاڵ | |
| مشروع | پڕۆژە | |
| مشورة | راوێژ | بڕوانە : « مشاورة » . |
| مصح | بوژانـگە | بڕوانە : « دار النقاهة » . |
| مصدر ( البحث ، الشيء او الخبر ) | سەرچاوە | |
| - المصدر المذكور سابقاً | سەرچاوەی ناوبراو | |
| - نفس المصدر | هەمان سەرچاوە | |
| مصدر ( قواعد ) | چاوگ | لە کتێبی فێرگەکاندا ( چاووگ ) بەکار هێنراوە ( « پـەروەردەو زانسـت » ، ل ۱۷٦ ) . |
| مصدره ( اموال ) | نـاردە | بڕوانە : « مستوردة » . |
| مصطبة | سەکۆ | |

| | | |
|---|---|---|
| مصطلح | زاراو | بڕوانه : «إصطلاح». |
| مصفاة (النفط) | پارزۆنگ | له هەندێك ناوچەی کوردستان (پارزونگ) به مانای (چاباڵێو) بەکار دەهێنن؛ بڕوانه : «تصفية». |
| مضمد | برین‌پێچ ، تیمارکار | بڕوانه : «تضميد». |
| مطابق | یەکچین | بڕوانه : «تطابق». |
| مطار | فڕگه | به شوێنی هەڵفڕینی کەو دەگوترێت (فڕگه)؛ (فڕۆکەخانه) لەسەر زمان قورسترە. |
| مطلع | شارەزا | له (شارزاوه)وه وەرگیراوه که دەکاته (له شار له دایك بوو)، خەڵکی شار شتیان زیاتر زانیوه... |
| مُعار | خواسته | بڕوانه : «إستعارة»، «مستعار»، «مستعير» و «معير». |
| معارضه | بەربەرەکانی | دوور نییه له (بەر رقانێ) وه هاتبێت. |
| معاملة | ئیش | لەناو خەڵکیدا باوه. |
| ـ معاملة رسمية | ئیشی میری | |
| معاهدة | پەیمان | بڕوانه : «حلف» |
| معدل | تێکڕا | |
| ـ المعدل الاسبوعي | تێکڕای حەفتانه | |
| ـ المعدل السنوي | تێکڕای ساڵانه | |
| ـ المعدل الشهري | تێکڕای مانگانه | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ المعدل اليومي | تێکڕای ڕۆژانە | |
| معرض | پیشانـگە | واتە جێگەی پیشاندان . |
| مُعرّف | دیاردە | بڕوانە : « تعریف » . |
| معقد | ئاڵۆزاو | دەتوانین بڵێین : ئەم باسە باسێکی یەکجار ئاڵۆزاوە ، یا ئاڵۆزە ؛ بڕوانە : « تعقد » . |
| معلم | فێرکار | واتە کارەکەی فێرکردنە ؛ بڕوانە : « مدرس » . |
| معهد | ئامۆژگـا | |
| ـ المعهد العالي | ئامۆژگای بەرز | |
| معونە | یاریدە | |
| ـ معاونە | یاریدەدان | |
| مُعیر | خوازگـر | لە ( خوازراو(ر) )ەوە داتاشراوە : قیاس لەسەر : نیازگر ، ڕێزگر...؛ بڕوانە : « استعارة » ، « مستعار » ، « مستعیر » و « معار » . |
| معین ( فراش ) | بەردەست | |
| مفتش | پشکنەر | بڕوانە : « تفتیش » . |
| مفرد | تاك ( تاق ) | |
| ـ بائع المفرد | تاکفرۆش | |
| مقابلة ( صحفیة ) | دیدەنـی | |
| مقابلة ( للاختبار ) | ڕۆبژار | وشەیەکی داتاشراوی نوێیە ، واتە ڕۆ بەڕۆ دەیانبینێتو لێیان هەڵدەبژێرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| مقال | وتار | |
| مقام | پایە | بڕوانە : « مكانة » . |
| مقاول | بەڵێندەر | |
| مقايضة | ئاڵشت | لە هەورامانو دەوروبەری باوە . |
| مقدرة | توانایی | |
| مقدمه (عربونا) | پێشەکی | دەڵێن : دوو دینار پێشەکیت دەدەمێ ... |
| مقدمة (الكتاب) | پێشەکی | |
| مقر (عسكری) | بنکە | بڕوانە : « قاعدة » . |
| مكافأة | پاداشت | |
| مكافحه | قڕان | |
| ـ مكافحة الحشرات | گەزندە قڕان | بڕوانە : « حشرة » . |
| مكانة (منزلة) | پایە | بڕوانە : « مقام » . |
| مكتبة | کتێبخانە | دەمێکە بەکار دەهێنرێت ؛ (نامە خانە)ش بەکار دەهێنرێت کە مانای (جێگەی نامە) بە نەك کتێب بۆیەکا باشتر وەهایە بۆ « دار الوثائق » بەکار بهێنرێت ؛ بڕوانە : « دار الوثائق » . |
| مكرر | دووپات | بڕوانە : « تأكيد » و « تكرار » . |
| مكمل (في الدرس) | دواکەوتە | بڕوانە : « إكمال » . |
| مكياج | ئارایشت | |

| | | |
|---|---|---|
| ملاحظ | تێبین | |
| ملاحظة | تێبینی | |
| مِـلاك | کادر | |
| ملحق ( الکتاب ) | پاشکۆ ، پاشەك | |
| ملخص | پوختە | بڕوانە : « مختصر » . |
| ملزمة | بەست | دەتوانین بڵێین : ئەم گۆڤـارە پـەنجا بەسـتە ، دو بەسـتی کتێبەکە چاپکراوە ... |
| ممتـاز | نایاب | وەك : « Excellent » ؛ بڕوانە : « جید » و « جید جداً » . |
| ممثـل | نوێنەر | |
| ممثل ( فنان ) | ئەکتەر | |
| ممر جوي | گوزەرگا | |
| ممر مائي | بوار | |
| ممشی | پێڕەو | بڕوانە : « رصیف » . |
| مناخ | ئاووهەوا | |
| منادی | جارچی | |
| منافسة | هاڤرکێ ، هاوچاوی | هاڤرکێ لە ( هاورکێ ـ هاوڕقێ ) واتە ( رقـەبەرێ ) وە هـاتووە ؛ لە هەندێك ناوچەی بادینان بـەکار دەهێنرێـت ؛ کوردی سـۆڤێت ( hevra ketin ) بەکار دەهێنن ( Farizov ..., L· 643 ) ؛ بڕوانە : « تنافس » . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ منافس | هاوڕك ، هاوچاو | |
| مناقصة | کەمگرێ | بڕوانە : « مزايدة » . |
| ـ مناقص | کەمگر | بڕوانە : « مزايد » . |
| منبر | بەرزەك | |
| منشور | پەخشە | لە ( پەخش ) ەوە وەرگیراوە ؛ دەتوانین بڵێین : پەخشەی ژمارە چوار ... |
| منصة ( الخطابە ) | دوانگە | واتە جێگەی دوان ؛ بڕوانە : « خطبة » . |
| منطقة | ناوچە | |
| منظف | پاکەوان | بڕوانە : « كنّاس » . |
| منهج ( برنامج ) | بەرنامە | |
| مهرب | قاچاخچی | بڕوانە : « تهريب » . |
| مهرج | کۆسە | |
| مسهم | گرنگ | |
| مهمل | کەمتەرخەم ، خاویلکە | بڕوانە : « إهمال » . |
| مهندس | ئەندازیار | دەمێکە بەکار دەهێنرێت ؛ بڕوانە : « هندسە » . |
| مهنة | پیشە | |
| مهیء | ئامادە | مەردۆخ بۆ هەمان مەبەست بەکاری هێناوە ( بەرگی ـ١ـ ، ل ٢١ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| مؤامرة | پیلان | |
| ـ متآمر | پیلان گێڕ | |
| مواجهة | ڕوَبەڕوَ کردن | |
| مواد | کەرەستە | |
| مواد مستهلكة | شڕە | بڕوانە : « إستهلاك » . |
| مواطن | هاوزێد | بڕوانە : « جنسية » . |
| موافقة | ڕەزامەندێ | |
| ـ موافق | ڕازیم | |
| مؤسسة | دەزگا | بڕوانە : « جهاز » ؛ لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردەو زانست » ، ل ١٤٩ ) . |
| موسم ( زراعي ) | وەرز | لە زۆربەی هەرە زۆری لادێکاندا بەکار دەهێنرێت |
| موضوع | بابەت | |
| موظف | فەرمانبەر | |
| موقف | گرتوخانە | بڕوانە : « سجن » ، « سجين » و « محبوس » . |
| ـ موقوف | گرتوو | |
| موقف | هەڵوەست | لە ( هەڵوێست ) باشترو ئاسانترە ؛ دەتوانین بڵێین : هەڵوەستێ بەرامبەر بەم کارە باشە ... |
| موقف ( الباص ) | وێستگە | وانە ( جێگەی وێستان ) . |

| | | |
|---|---|---|
| موقف (السيارات) | مۆڵگه | بەرامبەر « Parking » ؛ ( مۆڵگه ) له ئەسڵدا بۆ مێگەل بەکار دەهێنرێت ، لێرەدا ماناکەی فراوان کراوە . |
| میسرة | چەپەنگ | بڕوانه : « قلب » و « میمنه » . |
| میکروسکوب | وردبین | وەك : دووربین . |
| میمنة | راستەنگ | بڕوانه : « قلب » و « میسرة» . |
| میناء | بەندەر | |

## - ن -

| | | |
|---|---|---|
| نائب (فی البرلمان) | نوێنەر | بڕوانه : «ممثل» . |
| نائب (وکیل) | جێگر | بڕوانه : « وکیل » . |
| - نائب المحافظ | جێگری پارێزگار | بڕوانه : « محافظ » . |
| ناجح | رەسیو | له هەندێك شوێن ( رەخسیو ) بەکار دەهێنرێت ؛ رەسی ، دەڕەسێ ، دەڕەسی ؟ ... |
| ناحیه | مەڵبەند | بڕوانه : « قضاء » و « محافظة » . |
| - مدیر ناحیه | مەڵبەندار | بڕوانه : « قائمقام » و « محافظ » . |
| نادراً | بە دەگمەن | |
| ناقد | رەخنەگر | بڕوانه : « نقد » . |
| نتیجه | ئەنجام | |

| | | |
|---|---|---|
| نثر | پەخشان | دەمێکە بەکار دەهێنرێت . |
| ـ ناثر | پەخشیار | |
| نثرية | وردەخەرجی | |
| نحاس | مس | |
| نداء | بانگەواز | |
| ندوة | مەکۆ | لە زۆر ناوچە بەکار دەهێنرێت ؛ دەگوترێت : دڵم مەکۆی خەمانە ؛ مەکۆی دزان ـ واتە جێگەی کۆبۆنەوەی دزان ... |
| نسبة | هاوگرێ | مەردۆخ ( هاوگەری ) ی بۆ هەمان مەبەست داناوە ( بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ٨٦٧ ) ؛ دەتوانین بڵێین : هاوگرێ ئاو لەگەڵ ئاگر پێچەوانەیە ... |
| ـ متناسب | هاوگر | |
| نسخة | ڕۆنۆس | |
| نشاط | چالاکی | |
| نشاف | مژەك | |
| نشره | پەخشە | لە ( بڵاوکراوە ) کورتترو باشترە ؛ بڕوانە : « منشور » . |
| ـ نشرة مدرسية | پەخشەی فێرگە | بڕوانە : « مدرسة » . |
| نص | سایە | بڕوانە : « متن » . |
| نصيحة | ئامۆژگاری | |

| | | |
|---|---|---|
| نظام ( الحكم ) | رژێم | دەمێکە بۆ ئەم مانایە بەکار دەهێنرێت . |
| نظام ( کمصطلح قانونی ) | پێڕەو | لە ( پێ رۆیشتن ) ەوە داتاشراوە ؛ « پەیڕەو » بە مانای « نظام » هەڵەیە ، وشەیەکی فارسییە بە واتای « تابع » و « معتنق » دێت ؛ لە کوردیشدا ( پەی ) بە مانای ( بۆ ) دێت ، وەك ئەوەی دەڵێن : پەی سەرم دەگەزێت ... |
| نقابة | جڤات | خانی ( جڤین )ی بۆ کۆبوونەوەو خرۆشانی خەڵکی بەکار هێناوە ، دەڵێت : شاهی بجڤن ... ؛ جەلادەت بەدرخان لە (Hawar)دا جارەهای جار ( جڤات )ی بەکار هێناوە ؛ جگەرخوێنیش بۆ هەمان واتای داناوە (بەرگی -٢- ، ل ٥)؛ کوردۆیێف ( جڤاك )ی بۆ ( کۆمەڵ ) و (جڤان) و (جڤین)یشی بۆ کۆبوونەوە داناوە . ( Q. Kurdo..., L.144 ) |
| - رئيس النقابة | سەرجڤات | |
| - الهيئة النقابية | دەستەی جڤات | |
| نقالة | دەستەبەر | |
| نقد | رەخنە | ( رەخنە ) بە مانای کەڵین دێت ؛ مەردۆخیش بۆ هەمان مانای بەکار هێناوە ( بەرگی -١- ، ل ٨٧٠ ). |
| - نقد فنی | رەخنەی هونەری | بڕوانە : « فن » . |
| نقد | دراو | بەرامبەر بە « Money » . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ سك النقود | دراو ليدان | |
| نقدى | نەختینە | بڕوانە : « عینی » . |
| نقطة | خاڵ | |
| نقل | گواستنەوە | |
| نموذج | نموونە | |
| نـوع | جـۆر | دەتوانرێت « تصریف » بکرێت ، وەك : بیجۆرێنە ، واتە « حدد النوع » ؛ ( بیجۆرێنە ) قیـاس لەسەر بیگونجێنە ... |

## ـ هـ ـ

| | | |
|---|---|---|
| هجری | کۆچ | |
| هندسە | ئەندازە | بڕوانە « مهندس » . |
| ـ الهندسە المجسمة | ئەندازەی بەرجەست | بڕوانە : « مجسمة » . |
| هوية | پێناس | واتە پێی دەناسرێیت . |
| هيئة | دەستە | |
| ـ الهيئـــە الاستشارية | دەستەی راوێژ | بڕوانە : «إستشارە» ، «مستشار» و « مستشیر » . |
| ـ هيئـــة التحرير | دەستەی نووسەران | |
| هيبة | سـام | دەگوتـرێت : سـام گرتـمی ، پیاوێـکی بەسامە ... |

## - و -

| | | |
|---|---|---|
| واجب | تەوزیم ، ئەرك | |
| واجب الدفع | بدەیتی | |
| واردة (الكتب الرسمیه) | هاتـو | بڕوانە : « صادرة » . |
| واعـظ | پەندیار | بڕوانە : « عبرة » و « عضة » . |
| وتر (هندسی) | تیره | بڕوانە : « دائره » ، « قطب » ، « قطر » و « محیط » . |
| ودیعة | سپارده | |
| وزارة | وەزارەت | ئەم وشەیـە لە ڕێـگەی زمانـی فارسییەوە تێکەڵی زمانی عـەرەبی بووە . |
| - وزارة الاشغال والاسكان | وەزارەتی ئیش و خانەسازی | |
| - وزارة الأصلاح الزراعي | وەزارەتی زەوی سازی | |
| - وزارة الاعلام | وەزارەتی ڕاگەیاندن | بڕوانە : « إبلاغ » و « إعلام » . |
| - وزارة الاقتصاد | وەزارەتی ئابووری | |
| - وزارة البلدیات | وەزارەتی شارەوانی | |
| - وزارة التجارة | وەزارەتی بازرگانی | بڕوانە : « تجارة » . |
| - وزارة التخطیط | وەزارەتی پلان دانان | بڕوانە : « تخطیط » . |
| - وزارة التربیة | وەزارەتی پەروەردە | بڕوانە : « تربیة » . |

ـ وزارة التعليم العالي والبحث العلمي | وەزارەتی خوێندنی بەرزو تۆژینەوەی زانستی | بڕوانە : « بحث » و « تحقیق ».

ـ وزارة الخارجیة | وەزارەتی هەندەران | ( هەندەران ) لە موکریان زۆر باوە .

ـ وزارة الداخلیة | وەزارەتی ناوخۆ | بڕوانە : « داخلیة » .

ـ وزارة الدفاع | وەزارەتی بەرگری

ـ وزارة الري | وەزارەتی ئاودێری

ـ وزارة الزراعة | وەزارەتی چاندن

ـ وزارة الشباب | وەزارەتی لاوان

ـ وزارة شؤون الشمال | وەزارەتی کاروباری باکور | بڕوانە : « شمال » .

ـ وزارة الصحة | وەزارەتی تەندروستی

ـ وزارة الصناعة | وەزارەتی سازکاری

ـ وزارة العدل | وزارەتی داد

ـ وزارة العمل والشؤون الاجتماعية | وەزارەتی کارو کۆمەڵ

ـ وزارة المالیة | وزارەتی دارایی | بڕوانە : « مالیة » .

ـ وزارة المواصلات | وزارەتی پەیوەستی

وزیر | وەزیر

ـ وزیر الدولة | وەزیری دەوڵەت

| | | |
|---|---|---|
| وصل | پەتە | ئەدای شێر دەڵێت « بطاقـه »ی عەرەبی لە ( پەتك )ی فارسییەوە وەرگیراوە ( السید ادی شیر ، کتاب الألفاظ الفارسیه المعربة ، طهران ، ١٩٥٦ ، ص ٢٤ـ٢٥ ). |
| وصية | راسپێری | بڕوانە : « توصية » . |
| وطن | نیشتمان | |
| وعاء | دەفر | |
| وعر | ناهەموار | بێچەوانەی (هەموار)ە ؛ دەگوترێت: رێگـەی هەوراماں ناهەموارە ؛ مەردۆخیش بۆ هـەمان واتـا بەکاری هێنـاوە (بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ٧٥٤ ) ؛ بڕوانە : « تمهيد » . |
| وقائع | گـوزارشت | |
| ـ وقائع الجلسة | گوزارشـتی کۆبونەوە | |
| وكالة ( الانباء ) | ئاژانس | ماوەیەکە بلاّو بۆتەوە . |
| وكالة ( ورقة الوكالة ) | برینامە | لە ( بری نامە )وە داتاشراوە . |
| وكالة | بریکاری | بڕوانە : « وکیل » . |
| وکـیل | بریکار | لە ( بری کار )ەوە وەرگیراوە ؛ دەگوترێت لە بـری ( یا بریتی ) تۆ ، لە بری من ... ؛ دەتوانین بڵێین : بریکاری سەرەك وەزیران ، بریکاری مـن لە دادگە فـلانـە کەسە ... |

* * * * * *

# بەشی دووەم

## لە بارەی
## لیستەی یەکەمی (زاراوی کارگێڕی) یەوە

بەشی یەکەمی ئەم کتێبەمان لە ژمارە یەکی (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)ا بڵاوکردەوە[1] وە لەوێدا بەم جۆرە داوای یارمەتی و هاریکاریمان لە برا شارەزاکانمان کردبوو :

« زۆر بە گەرمی داوا لە مامۆستا کوردە دڵسۆزەکان دەکەین بە وردی سەرنجیان بدەنێ و لێیان بکۆڵنەوە و بیری خۆیانمان لە ماوەی شەش مانگدا پێ رابگەیێنن بۆ ئەوەی ئەنجومەنی کۆڕ بتوانێت بە شێوەیەکی باشتر دوا بڕیاری خۆی لە بارەیانەوە بدات » . هەروەها « هیچ دوریش نییە گەلێك زاراو هەبن ئێمە هەستمان پێ نەکردبن و[؟] لە[؟] هەندێك لەم زاراوە پێشنیارکراوانە باشتر بن ، لەبەر ئەوە تکا لە هەمو برایەکی کوردی خوێندەوار دەکەین ، بە تایبەتی ئەو مامۆستایانەی لە ناوجەرگەی لادێکاندا کار دەکەن ، دەستی

---

(١) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٤٢٣ – ٥٢٥ .

یارمەتیان بۆ درێژ بکەن و هەر پێشنیارێکیان هەیە بە زوترین کات پێشکەشمانی بکەن »[٢] .

ئەم داوا گەرمەی کۆڕ و زاراوەکانی دەنگێکی باشیان لە ناو شارەزا و خوێندەوارانی کوردا دایەوە و خامەی زۆریانیان بزواند و بەرهەمی بایەخداری ئەمەش بریتی بو لە گەلێك وتاری بەکەڵك کە لە رۆژنامەکاندا بــڵاوکرانەوە[٣] جگە لەو نامانەی یەکسەر بە کۆڕ خۆی گەیێنران . تەنانەت رایەکی رۆشنبیری دوروڵاتی وەك کاك نەوشیروان مستەفا لە ڤیەنەوە وتارێکی درێژی لە بارەی زاراوەکانی کۆڕەوە ناردبو بۆ رۆژنامەی رازاوەی « هاوکاری » و بــەم شێوە جوانە داواکەی کۆڕی ئرخاندبو :

« ئەوی راســت بێت مــن بەش بە حاڵی خۆم ئەم پرس بە خەڵـکی .... و ئاوڕلێدانەوەیە بە دەسپیشکەریەکی مەزن و بە مژدەدەری پاشەرۆژێکی رون و پڕکاری پوخت و بە کەڵك بۆ کۆڕی زانیاری کورد لە قەڵەم ئەدەم »[٤] .

ئەم بەرەوپیرچونە گەرمەی رۆشنبیری کورد مایەی خۆشی و جێی شانازییە بە تایبەتی چونکە کەم و زۆر گومان لەوەدا نییە کە

---

(٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٤٢٢ ـ ٤٢٣ ؛ هەروەها بڕوانە لاپەڕە ٦ و ٧ ی ئەم کتێبەش .

(٣) بە تایبەتی لە « هاوکاری » و « زین » و « برایەتی » دا .

(٤) « هاوکاری » ، ژمارە ( ١٧٧ ) ی رۆژی ٢٧ ی ئەموزی ١٩٧٣ .

هەستی خاوێن و دڵسۆزیی بێگەرد جوڵێنـەر و هاندەریی بەرودوای هەمو ئەو برا بەڕێزانەن کە بیری خۆیان لە بارەی لیســتەی یەکەمی زاراوی کارگێڕیی کۆڕەوە دەربڕیوە . ئەنجومەنی کۆڕیش هەر لەو رادەیەدا بایەخی پێدان و بە پێی پێویست کەڵـکی لێ وەرگرتن و بۆ ئەم مەبەستە بەر لە هەمو کارێك لیژنەیەکی تایبـــەتی لە ژمارەیەك ئەندامی کارا و یاریدەری خۆی دامەزراند کە بە وردیی لە هەمو ئەو پێشنیار و رایانە کۆڵییەوە کە لەو وتار و نامانەدا تۆمار کرابون ، ئەویش پوختەی کارەکانی خۆی لە راپۆرتێکدا پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆڕ کرد .

بێگومانـ مەرج نییە هەمو یا زوربەی ئەو پێشنیارانەی لە بارەی لیستەی یەکەمی (زاراوی کارگێڕی) یەوە پێشـکەش کراون راست بن یان خاوەنەکانیان لە بیروڕایاندا لەگەڵ یەکتر گونجا بن . هەر بۆ بەڵـگەش وا لێرەدا چەند نمونەیەکی کەم دەخەینە بەر چاو :

یەکێك لەو برا بەڕێزانەی بە نامە بیروڕای خۆی پێ راگەیاندوین رەخنەی لێگرتوین ـ راستێکەی کەمێکیش بە توندیی ـ کە بۆچی ئێمە وشـــەی « وەزیر و وەزارەت » ی عەرەبیمان وەرگرتووە و « شالیاریی » یەتیی خۆمانمان فڕێ داوە ! . هەرچەندە زوربەی رۆشنبیری کورد دەزانن کەی و بۆچی و چۆن وشەی « شالیار » هاتـە کایەوە ، دەڵێین : « وەزیر » و « وەزارت » عەرەبـیی نین ، عەرەب خۆیشی دانی پەمەدا ناوە و دەڵێ لە رێـگەی زمانی فارسییەوە

تێکەڵی زمانی عەرەبی بووە ، جگە لەوە وشـەی وەزیر لە هـەر قوژبنێکی کوردستان و شێوەکانی کوردیدا باو و بڵاو و بەکار هێنراوە .

بەرامبەر بە « محیط هندسي » کە کۆڕ ( پەراوێز )ی بۆ داناوە ، دوو پێشنیارمان بۆ هاتووە : ( چێـــوە ) و ( شیانە ) کە بـــە لای ئەنجومەنەوە هیچ کامێکیان بۆ « محیط هندسی » دەست نادەن ؛ بە وێنە ( چێو ) خۆی مانای ( دار )ە و بەو جۆرە ( چوارچێوە ) چوارداره دەگرێتەوە ؛ بۆ ( پەراوێز )یش هیـچ مەرج نییـە تـەنها دامێن بگرێتەوە . بەرامبـەر بە « مستوى »ش دوو پێشنیارمان بۆ هاتووە : ( ڕێك ) و ( ڕیزە ) ، بەڵام بەلای ئەنجومەنەوە ( ڕێـکار ) باشتر و گونجاوترە ، بە وێنە ناتوانین بڵێین ( ڕێکی یان ڕیزەی ژیان ) ، بەڵام ( ڕێکاری ژیان ) پڕ بەپێـتی « مستوى المعیشە »یە ، جگە لەوەی وەك زاراوێکی « هندسی »ش دەست ئەدا .

سـێ نموونەی تر : بۆ « مستعیر » کە کۆڕ ( خوازەر )ی بۆ داناوە ( خـوازەڵۆك )مان بۆ هاتووە ، بەڵام بـە لای ئەنجومـەنەوە ( خوازەر ) کە بە ڕوونی ئەو کەسە دەگرێتەوە شـتێك ( بخوازێ ) لە ( خوازەڵۆك ) باشترە کە بە سوکایەتی بەو کەسە دەگوترێ بێ وێزە شت دەخوازێ ، وەك ئەوەی دەڵێن ( ئافرەتێکی خوازەڵـۆکە ) . بۆ «موقف السیارات» یش کە کۆڕ ( مۆڵـگە )ی بۆ داناوە (هەوێز)مان بـــۆ پێشنیار کراوە ، بەڵام بە لای ئەنجومەنەوە زاراوەکەی خۆی لەو مەبەستە نزیکترە چونـکە ( هەوێز ) بەو شوێنە دەگوترێ کە بە

شەو مەڕی تێدەکرێ ، بەڵام (مۆڵگە) جێگەی وەستانی وڵاغە . بۆ « مراقبة » ش (زێرەوانی) مان بۆ هاتووە هەرچەندە (زێرەوان) تەنها بە مانای حەرەسی گۆڕ و گۆڕستان دێت .

ژمارەیەك مامۆستای بەڕێز لە نامەکانیاندا دەڵێن نابێ فەرهەنگی مامۆستایانی وەك تۆفیق وەهبی و خاڵ و مەردۆخ و کوردۆیێف و ئەوانی تر بکرێنــــە « داردەست » و بەڵگە بۆ دانانی زاراو . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمــە ناچارین بە چەنـد دێڕێـکی کەم ڕێبـازی کۆڕ لە هەڵبژاردن و داتاشینی زاراودا بخەینە بەر چاو[٥] :

بەر لە هەموو کارێك ئەو زاراوە عەرەبییـانەی[٦] بە پێویست دەزانرێن کۆدەکرێنەوە و بە ڕیز دەخرێنە بەردەمی ئەنجومەن کە ئەندامانی زۆر بە وردی یەك لە دوای یەك لێیان دەکۆڵنەوە ، واش بووە سەعاتێك وتووێژ و گفتوگۆ لەسەر وشەیەك کاری بە ئەنجام نەگەیاندووە . بۆ هەر وشــــە و زاراوێك ئەندامانی ئەنجومەن بیر لەوە دەکەنەوە ئاخۆ لە شێوە جیاوازەکانی زمانی کوردیدا ، یا لە ناوچــــە کەلا و دوورەکانی کوردستاندا یا لە ناو هۆز و تیرە کوردەکاندا چی بەکار دەهێنن ، لە بەیت و بەندی باودا ، لە پەندی

---

(٥) هـەر لەم بارەیەوە چـەند شتێکمان لە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕدا بلاوکردۆتەوە ( بڕوانە ل ٤١٩ ـ ٤٢٣ ی ئەو ژمارەیە ) هەروەها بڕوانە بێشەکی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە .

(٦) چونکە خوێندەواری کوردی عیراق عەرەبی لە هەموو زمانێکی تر باشتر دەزانێ .

پێشنیاندا ، لە وتەی شاعیراندا چیان هەن دەست بدەن و دوای ئەوەی بیری ئەندامان لە بارەی وشە یا زاراوێکەوە ڕوَن دەبێتەوە سەیری ئەو فەرهەنگانەش دەکەین کە خاوەنە بەڕێزەکانیان جێی بڕوان و کارەکانیان بەرهەمی زانێن و پشکنێن و شەونخونێن ، جا ئەگەر بیری ئەوانیش وەك بڕیارەکەی ئەنجومەن بۆ دەیکەینە بەڵگەو یاریدەری قسەمان .

ئەنجومەنی کۆڕ بە وردی لە چەند کۆبونەوەیەکیدا لە ڕاپۆرتی لیژنەکە کۆڵییەوە و ئەو ئاڵوگۆڕانەی بە پێویستی زانێن لە بەشی یەکەمی زاراوە بڵاوکراوەکانی کۆڕدا کردنی و وا لەم لیستەیەی خوارەوەدا بڵاویان دەکەینەوە . بەم بۆنەیەشەوە زۆر بە گەرمی و پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا بەڕێزانە[٧] ئەکەین کە دڵسۆزانە لە زاراوەکانی کۆڕ کۆڵیبونەوە و هیوامانە لەمەودواش هاریکاریمان لەگەڵ بکەن تاوەکو لە توانا و بەرهەمیان بێبەری نەبین .

---

(٧) ئەم برایانە لە ڕێگەی وتار و نامەوە بیری خۆیان لە بارەی زاراوەکانی کۆڕەوە دەربڕیبو : صەلاح سەعدوڵلا ، حامیدفەرەج ، تاهیر صادق ، نەوشیروان مستەفا ، محەمەد مەولوود ( مەم ) ، شێخ مارف قەرەداغی ، عەمید ئەحمەد حەسەن ، بەدرخان سندی ، عەزیز گەردی ، محەمەد ئەمین عوسمان ، جەمال عەبدول ، جەلال مەحموود عەلی ، جەمال محەمەد ، غەفوور ڕەحیم ، محەمەد کەریم شەریف ، ئەندازیار جەلال مەحمەت خۆشناو و چەند برایەکی بەڕێزی تر .

| زاراوی عەرەبی | دەبێتــــە : | تێبینی |
|---|---|---|
| إبداع | جوانــکاری | |
| إتحاد | یەکەتی | بەو جۆرە لەگەڵ دەستووری زمانی کوردیدا دەگونجێ ئەگینا ( یەکێتی ) دەبێ لە ( یەکی )یەوە وەرگیرابێ . |
| إحراقیە | ئاردوێ | لە ناو کرمانجدا بەو جۆرە باوە ؛ لە سۆرانیدا دەگوترێ : ئاوردوێ ؛ ئاوردوێ لە ( سونەمەنی ) سووکترە . |
| إحضار | هێنان | وانــە بــۆ هێنانی یەکێك ؛ ( ئامادەکردن ) بۆ « تهیئة » و « تحضیر » بەکار بهێنرێ . |
| أخلاق | ئاکار | ( رەوشت ) مانای « سلوك » و « سیرة » دەبەخشێ . |
| إدخار (عملیة الادخار) | پاشەکەوتی | ( پاشــەکەوت ) « المبلــغ » یــا « المقدار المدخر » دەگرێتەوە . |
| إذاعة | ئیستگە | |
| ـ إذاعة ( الخبر أو النشرة ) | بەلاڤ | کرمانجییە ، لە سۆرانیدا ( بلاو )ە . |
| إرتفاع | بەرزی ، بەژن | راستە ( بەژن ) مانای ( قەد )ەو (بەرزی) «إرتفاع» ، بەلاّم جاری واش هەیە یەکەمیان بۆ هەمان مەبەست بــەکار دەهێنرێ ، وەك ( بەژنی شاخ ) ؛ ( بەرزی ) وەك زاراوێکی ئەندازیاری جێگەی « علو » وانە= |

| | | |
|---|---|---|
| | | =« Altitude » و ( بەژن )یش جێگەی « Height » دەگرێتەوە . |
| إستثناء ( عملية الاستثناء ) | هەڵاوردن | « Exception » . دەڵێن : بۆ لە هاوزێکانی خۆمم هەڵداوێری ؛ مەردۆخ ( هەڵهاوردن )ی بەکار هێناوە ( بڕوانە : « فرهنگ مردوخ » ، جلد ـ١ـ ، ل٥٣ )؛ ( جگە لە ) بۆ « باستثناء » بەکار بهێنرێ ؛ بۆ « إستثناء من القاعدە» دەتوانین بڵێین : لە دەستور هەڵئاوێردن . |
| إستثناء من القاعدة | لە دەستور هەڵئاوێردن | بڕوانە : « إستثناء ـ عملية الاستثناء ـ » . |
| إستعاره | خوازینەوە | |
| إستقطاع | بڕین | تەنها لە رستە و شوێنی پێویستدا (دا ) و ( لێ )ی بخرێتە سەر ، وانە بکرێتە ( لێ بڕین ) و ( داپڕین ) . |
| إستهلاك ( إستهلاك الشخص الشيء ) | تێ بردن | |
| إستهلاك ( أيلولة الشيء الى الاستهلاك ) | تێچوون | |

| | | |
|---|---|---|
| إسطوانة | لوله | له رووی ئەندازیارییەوە ( لوله ) له ( کوله که ) زیاتر ده‌گونجیٚ ؛ مه‌رج نییه ( لوله ) هه‌موو کات بوٚشی تێدا بیٚ ـ به ئه‌سپیندار ده‌گوترێ : ئه‌و داره لوله‌یه ...؛ بوٚ « انبوب »یش ده‌توانین ( بوٚری ) به‌کار بهێنین . |
| الاضبارة الشخصية | دوٚسیه‌ی که‌سی . | |
| إطفائية | ئاگرمرێنێتی | له کرمانجیدا ده‌لێن : ئاگری وه‌مرێنه . |
| ـ إطفائي | ئاگرمرێن | |
| اعلام الزوجية | ماره‌نامه | له ( به‌ڵگه‌ی خێزانی ) سووکتر و به ماناتره . |
| إقرار ( إعتراف ) | دان‌پێدانان | |
| البان | ریچاڵ | له بادینان به هه‌موو به‌رهه‌مه‌کانی شیر ده‌گوترێ . |
| انبوب | بوٚری | |
| إنقراض | قڕ تێ‌که‌وتن | |
| بدالة ( تلفون ) | بگوٚڕ ( ته‌له‌فون ) | |
| تضامن | هاوئه‌رکی | |
| ـ متضامن | هاوئه‌رك | |
| تمشية ( معاملة ) | راییکرن | |

| | | |
|---|---|---|
| جدارة | شیاوی | ماموّستایان نوّفیق وەهبی و ئەدموّنس هەمان وشەیان بەکار هێناوە (T.Wahby,.. P.139). |
| ـ جدير | شیاو | |
| جملةً ( بالقطع ) | سەرپاك | « Lumpsum » ؛ دەتوانین بلێین : سەرپاکی کارەکە درایە فلانە قوّنتەراتچی... |
| حفار ( للشخص ) | هەڵکەن | |
| ـ حفارة ( للالة ) | کوّلینك | |
| حفلة ( غنائية او موسيقية أو راقصة ) | ئاهەنگ | ماموّستایان نوّفیق وەهبی و ئەدموّنس بوّ هەمان مەبەست بەکاریان هێناوە . ( T. Wahdy, ... P. 2 ) |
| ـ حفلة ( Party ) | بەزم | |
| ـ حفلة تأبين | پرسە | ماناکەی فراوان کراوە ، ( پرسە ) لە ئەسڵدا بوّ تەعزێ بەکار دەهێنرێ ؛ دەتوانین بلێین : پرسەی چلەی فلانە کەس ... |
| ـ قاعة الاحتفالات | بەزمگە | وانە جێگەی بەزم . |
| دائرة مكافحة الحشرات | فەرمانگەی قڕێ گەزندە | |
| دائرة ( هندسية ) | جغز | |
| داية ( للاشجار ) | نەمام | بڕوانە : « شتل » . |
| دفتر النفوس | سەرنامە | وانە ( خوّنامە ) کە لابرێ . |

| | | |
|---|---|---|
| دقيقة | دەقە | |
| دولة | دەوڵەت | هەموو کوردێـك دەیزانـێ و لە (کیشوەر) زۆر باوترە . |
| الرياضة البدنية | وەرزش | وانە وشەی ( تەن )ەکەی لابرێ . |
| سائق | هاژۆ | لە زۆر ناوچە دەڵێن : ولاخەکە بئـاژۆ ؛ لە موکریان دەڵێن : هێسـتر هاژۆیـە ؛ ( هاژۆ ) لە کرمانجیدا باوە . |
| سايلو | سایلۆ | ( سـایلۆ ) وشەیەکی ئیسـپانییە و زوربـەی زمانـانی تر لەوەوە وەریانگرتووە . |
| سجين | بەندی | |
| سداد | دەمەوانە | « Topcover » ؛ ( بشك ) یش بۆ « مـداد » « Plug » بەکار بهێنرێ . |
| سريع | خێرا | |
| السلامة الشخصية | گیانپارێزی | |
| سماعي | ژنەوتە | لە گەرمیان باوە ؛ ( ژنەفتە ) ش هەیە . |
| شاعر | شاعیر | (هۆنەر) یش بکرێ بە « ناظم » . |
| شتل | شەتڵ | بڕوانە : « دایـە » . |

| | | |
|---|---|---|
| صلصال | قوڕەچەورە | مەبەست لەو قوڕەیە کە « سیرامیك »ی لێ دروست دەکرێ . |
| قرار | بڕیار | |
| قطیع | گاڕان | |
| ماشیة | وڵسات | لە خۆشناوەتی و باڵەکایەتی لە ناو بڵباس و زۆر شوێنی تردا بەکار دەهێنرێ ؛ ( وڵسات ) لە ( گاڕان ) زۆرترە و ئەمیان بەشێکە لەویان ؛ ( گاڕان ) دەتوانرێ بۆ « قطیع الماشیة » بەکار بهێنرێ . |
| متقاعد | دانیشتە | قیاس لەسەر : اوکەوتە ، پەککەوتە ... |
| مجسم | بارسدار | ( بارست ) بۆ « حجم » دانراوە ؛ بۆ ئاسان کردن لە ( بارستدار )ەوە کراوە بە بارسدار . |
| محل الاستعارة ( مکان الاستعارة ) | خواسگە | |
| مخصصات | سەرمزە | ( مز ) بۆ « اجرة » بەکار دەهێنرێ . |
| مراسل | پاکار | |
| مستعجل | بلەز | ( لەز ) لە ناو کرمانجدا باوە ؛ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بۆ هەمان مەبەست = |

بەکاریان هێناوە...(T. Wahby,.
P. 84 )

| | | |
|---|---|---|
| مستل | دەرکشاو | |
| مسح (عملية المسح) | رووپیوان | |
| مسداد | پشك | « Plug » . |
| معار | خوازراو | واتــە وەك « مســتعار » ی لێ بکرێ . |
| مقدرة | توان | چونکە ( توانایی ) لە ( توانا )وە وەرگــیراوە و بــەو جــۆرە « القادرية » دەگرێتەوە ؛ دەڵێن : تێن و توانی هەیە ... |
| مقيم | نیشتەجێ | |
| ـ طبيب مقـيم | پـزیشـکی نیشتەجێ | |
| ـ مهندس مقيم | ئەنــدازیاری نیشتەجێ | |
| مكافحة (الامية ، الاستعمار ...) | بەربەرەکانێ | |
| مكافحة (الحشرات) | قڕ | چونکە ( قڕان ) تەنها بۆ زیندو بــەکار دەهێــنرێ ، دەگــوترێ : قڕانیان خستە بەرازێ ئەو ناوە ...، دەتوانین بــۆ ( دائرة مــكافحة الحشــرات ) بڵێین : فەرمانگەی قڕێ گەزندە . |

| | | |
|---|---|---|
| مكبرة ( عدسة ) | زەڕەبین | زۆر باوە . |
| منظم | ڕێکخەر | |
| ميكروسكوب | وردبین | لە هەولێر ( هورد ) و لە ناو کرمانجدا ( هوَر ) بەکار دەهێنرێ . |
| ناظم | هۆنەر | |
| نثرية | وردەخەرج | |
| نداء | گاس | ( گاز )یش بەکار دەهێنرێ ، بەلام بە مانای « عض »یش دێ ؛ ( گاس ) لە دەشتی هەولێر باوە . |
| نقالة ( المرضى ) | دارەبەست | لە لادێ دەڵێن : بریندار بۆ و دارەبەستیان بۆ کرد ... |
| نقالة ( يدوية — للحاجيات ) | دەستەبەرە | |

* * * * * *

## بەشی سێیەم

# لیستەی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ

ئەنجومەنی کۆڕ خۆی بە بەختیار دەزانێ لیستەی دووەمی زاراوەکانی بخاتە بەر چاوی خوێنەر و شارەزایانی بەرێز کە هیوامانە هەر وەك لیستەی یەکەمی سەرنجیان بدەنێ و لێیان بکۆڵنەوە و بیری خۆیانمان لە ماوەی شەش مانگدا پێ رابگەیێنن . تەجروبەی لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ بە ڕوونی نرخ و ئەنجامی هاریکاریی کۆڕ و شارەزا و زانایانی دەرخست و هیوامانە بتوانین جار لە دوای جار لەم مەیدانەدا هەنگاوی باشتر بەرەوپێش بنێین .

لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕمان ناو نابوو ( زاراوی کارگێڕی ) هەرچەندە لە ڕاستیدا هەموو زاراوەکانی کارگێڕیی نەبوون و زاراوی تری هەمە بابەتی تێدا بوو کە ئەنجومەن بڵاوکردنەوەیانی بە پێویست زانی . زاراوەکانی ئەم لیستەیەشمان هەمەجۆر و بابەتە بۆیەکا ئیتر لیستەکان بەپێی ژمارە ، نەك ناوەرۆك ، بڵاودەکەینەوە . هیوامانە لە دوارۆژدا بتوانین بەپێی باسیش ریزیان بکەین و بە جیا دووبارە

بڵاویان بکەینەوە .

زاراوەکانی ئەم لیستەیە ، هەروەك لیستەی یەکەم ، ئەنجامی لێدوان و لێکۆڵینەوەیەکی زۆری ئەنجومەنی کۆڕن کە بەشی زۆری کۆبوونەوەکانی بۆ تەرخان کردوون و ڕێبازی کاریشی لەم مەیدانەدا هەر ڕێبازەکەی ئەوسایەتی[1] لەگەڵ چەند تەجروبەیەکی نوێدا کە ئەنجامی کاری کۆڕ خۆی و پێشنیار و تێبینیی ژمارەیەك لە دۆستانین ، بۆیەکا لە پێشەکیی لیستەی زاراوەکانی ئەم جارەماندا تەنها چەند تێبینیی و ڕوونکردنەوەیەکی پێویست دەخەینە بەر چاو .

ئەنجومەنی کۆڕ لە کۆبوونەوەکانی خولی سێهەمیدا بایەخێکی زۆری بەو زاراوانە دا کە لە کتێبی فێرگەکاندا بەکار هێنراون و بەشی زۆریان لە گۆڤاری « پەروەردە و زانست »دا بڵاوکراونەتەوە[2] . ئەنجومەن بڕیاری داوە بەشێکی زۆر لە کۆبوونەوەکانی خولی چوارهەمیشی هەر بۆ ئەم کارە گرنگە تەرخان بکا کە بێ گومان

---

(۱) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ۱۹۷۳ ، ل ٤۲۹ - ٤٤۳ ؛ هەروەها بڕوانە ل ۳ - ٦ی ئەم کتێبە .

(۲) هەموو ژمارە چواری ساڵی دووی گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ( هاوینی ۱۹۷۲ ) بۆ ئەو زاراوانە تەرخان کراوە . شایانی باسە ( بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردی ) بە نامەی تایبەتیی داوای لە کۆڕ کردبوو سەیری ئەو زاراوانە بکاتەوە و دوابڕیاری خۆی لە بارەیانەوە بدا .

لە حەد بەدەر بایەخی بۆ ژیانی رۆشنبیر یمان هەیە .

ناوەرۆکی ئەم لیستەیە بە شێوەیەکی رۆن تــوان و دەسەلاتی فراوانی زمانی کوردی لەم مەیدانەدا نیشان دەدا و ئەمەش بێ گومان هەوێنی گەورە و مەرجی پێویستی سەرکەوتنی ئەم کارەیە .

لێرەدا بە پێویستی دەزانین سەرنج بۆ ئــەوە رابــکێشین کە وا هەڵبژاردنی وشە یا زاراوێك مانای پشت گوێ خستن یا مراندنی وشە و زاراوە هاووااتا کانی نییە و کارێــکی وا هەر بۆ خۆشی لە دەسەلاتی هیچ کەس و لایەکدا نییە ، بەلام زمانی کوردیش ـ وەك هــــەمو زمانێــکی تر ـ گەلێك وشە و زاراوی لەو بابەتەی تێدایە بۆیەکا هیچ نەبێ بۆ کتێبی فێرکەکان دەبێ وشە ئاســان و باو و لەبارەکەیان بــۆ هەڵبژێردرێ یا وشەیەکی ئەوتۆ کە یارمەتی نزیــك‌کەوتنەوە و تێــکەڵ بوونی شێوەکانی زمانەکەمان بدا یا لە دەستە خوشکەکەی رەســــەن و پەتی‌تر بێ .

بۆ نموونە : دیارە لە ولاتێــکی شـــاخاوی پڕ دارودرەختی وەك کوردستاندا گەلێك وشە بەرامبەر « غابة » دروســــت دەبێ ، وەك لێڕ و جەنــگەل و دارستان و بێشە و هی تر کە لە قســـە و کاری رۆژانەدا لەوانەیە هەموویان بەکار بهێنرێن و پێویستیشە یەك بەیەکیان لە فەرهەنــگی فراوانی کوردیدا تۆمار بکرێن ، بـــەلام وەك زاراو ئەنجومەن (لێڕ)ی لەوانی تر لا پەسەندترە چونــکە لە هەموویان باوترە و لە ناو کرمانجیش و سۆرانیشدا بەکار دەهێنرێ و لە (جەنــگەل) پەتی‌ترە

که له فارسیشدا هەیە . هەروەها بۆ « غاية اصطناعية » جگە لە ( چەم ) کە ئەنجومەن پەسەندی کردووە ( بێشە )ش بەکار دەهێنرێ . بەڵام یەکەمیان تەنها لە کوردیدا و دوەهەمیان لە فارسیشدا هەیە . یا ( خوسار ) لە ناو کرمانج و سۆراندا بە مانای « صقیع » بەکار دەهێنرێ بەڵام ( زوقم ) تەنها لە ناو یەکەمیاندا هەیە بۆیەکا بەلای ئەنجومەنی کۆڕەوە هەڵبژاردنی ( خوسار ) وەك زاراو لە جێترە .

نمونەیەکی تر : بێگومان ئەنجومەنی کۆڕ دەبێ هەر لە خۆڕا ( چینە )ی وەك زاراو بە لاوە لە ( دان ) بەرامبەر « علف للدواجن » پارسەنگتر نەبێ ، بەڵکو بە وردی بیری لەوە کردۆتەوە کە یەکەمیان دەق لە هەموو بار و روێەکەوە مەبەستەکە زیاتر دەگەیێنێ چونکە ( دان ) دەبێ لە « عطاء »ەوە یان لە ( دانە )وە هاتبێ کە ئەویش بۆ خۆی « حبة و حبوب »[٣] دەگرێتەوە ، کەچی مەرج نییە « علف الدواجن » لە هەموو حاڵێکیدا « عطاء »ی تێدا بێ یان تەنها « حبوب » بێ ، بۆیەکا ( چینە ) کە لە ( چنینەوە )وە هاتووە باشترە ، بەڵام لە فەرهەنگی کوردیدا دەبێ بەرامبەر « علف الدواجن » ( چینە )ش و ( دان )یش و ئەگەر هەبێ هیتریش بە ریز دابنرێن .

هەر بەو جۆرەش لە دانانی (کەڤر)دا بەرامبەر «صخر» دو مەبەست رەچاو کراوە ، یەکەمیان ئەوەتە کە وشەیەکی کرمانجییە و هەروەك چەند جارێك وتومانە بە لای ئەنجومەنی کۆڕەوە تێهەڵکێش کردنی

---

(٣) چێشتی ( دانوڵە ) لەوەوە هاتووە ، یا دەڵێن : بێ دانووە ..

سۆراتی بە وشـەی کرمانجی ، یا بە پێچەوانەوە ، هەنگاوێکی گەورە و مەرجێکی پێویستە بۆ دروستبوون و جێگیربوون و بڵاوبوونەوەی زمانی ئەدەبی یەکگرتومان ؛ دوەمیشیان ئەوەیە کە لە رێگەی ئەو جۆرە کارەوە دەتوانین سـامانی زمانەکەمان نیشان بدەین و بیپارێزین چونکە کە ( بەرد ) مان بۆ « حجر » دانا دەتوانین ( کەڤر ) بۆ « صخر » بەکار بهێنین و کوردیش لەم مەیدانەدا دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە .

لێرەدا بە جێگەی خۆی دەزانین سـەرنجی خوێنەری بەڕێز رابکێشین بۆ :

- لەم لیستەیەدا ، هەروەك لیستەی یەکەم ، هەندێك جار زاراوێك لە دوو شوێندا دوو بارە کراوەتە — جارێکیان لەگەڵ چاوگەکەیدا و جارەکەی تریشیان خۆی بە تەنها و مەبەستمان لەمە ئاسـانکردنی دۆزینەوەی زاراوەکانە .
- هەندێك زاراوی لیستەی یەکەم ئەمجارەش دوو بارە کراونەتەوە چونکە لە چەند روویەکەوە پێویستیان بە روون کردنەوە بوو .
- بە پێویستمان زانی هەڵەی هەندێك زاراوی بەکار هێنراو لە ژێر خانەی تێبینیی ئەم لیستەیەدا بخەینە بەرچاو .
- مەبەست لە ( ل ـ ١ ـ ) لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕە کە لە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕ و بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە .

• زۆر جار ئەو بەیتانەی لە ژێر خانەی (تێبینیی)دا وەك بەڵگە هێنراونەتەوە لە دێڕێکدا جێگەیان نەبۆتەوە هەرچەندە بەو جۆرەش ڕوخساری یەك بەیتی خۆیانیان نەدۆڕاندووە .

لە کۆتاییدا هیوامانە ئەم زاراوە پێشنیارکراوانە مایەی ڕەزامەندیی خوێنەری بەڕێز بن و بتوانن جێگەی خۆیان بگرن و بەو جۆرە کەلێنێك پڕبکەنەوە .

## - لیستی دووەم -

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردیی | تێبینیی |
|---|---|---|
| | - أ - | |
| أبقار | چەڤری ، پاتاڵ | ( چەڤری ) لە هەندێك ناوچەی بادینان باوە ؛ ( پاتاڵ ) لە سۆران باوە ؛ دەڵێن : ئازاڵ و پاتاڵ ، ئازاڵ ( یا ئاژەڵ ) بۆ حەیوانی بچوك و ( پاتاڵ ) بۆ هی بەرزە بەکار دەهێنرێ . |
| إتجاه | سەمت | لە بادینان و لە سۆران بەکار دەهێنرێ ؛ مامۆستا قەنانی کوردۆ بۆ هەمان مەبەست بەکاری هێناوە ( Q Kurdo ..., L. 659 ) . |

| | | |
|---|---|---|
| إتفاقية | ريككەوتن | |
| الأخذ بنظر الاعتبار | رەچاوكردن | |
| اخطبوط | جـله | له چیرۆك و داستانی كۆندا زۆر بەكار هێنراوه . |
| الأراضي المطرية | دێم | |
| الأرض التي لا تنبت | قاقڕ | |
| أرض جرداء | رووتەن | |
| ارض سيحية | بەراو | |
| أرض صخرية | رەقەن | |
| أرض قابلة للانجراف | شۆرەك | له ( شـۆران )ەوه هانـووه ؛ ( شۆرەك ) له زۆر ناوچه بەكار دەهێنرێ ، دەڵێن : ئەو خاكە شۆرەكە ... |
| ارض مالحة | شۆرەكات | ( شۆرە )ش هەر ( سوێری )یە . |
| إرواء ( اسقاء ) | ئاودان ، داشتن | |
| ازدحام | ئاپۆره | |
| إزعاج | جاڕزكردن | بڕوانه : « منزعج » . |
| أس | تین | « أس » له « Power »ەوه وەرگیراوه ؛ بەرامبەر « أس » ( بنـج ) دێ ، بـەلام لەبـەر ئەوەی « أس » لەسەرەوه دەبێ و ( بنج ) نیشانەی خوارەوەیه وەك |

| | | |
|---|---|---|
| | | =راراوێکی زانستی دەست نادا ؛ دەتوانین بلێین : سێ تێن سێ ، چوار تێن حەوت ... |
| اساس ( البناء ) | بناغە | بەرامبەر « Foundation » . بڕوانە ( ل - ١ - ) . |
| أساس ( للقضية أو المسألة ) | بنج | دەلێن : چووە بنج و بناوانی کارەکە ... ؛ بڕوانە « أس » . |
| استسلام | ملدان | |
| استقبال | پێشوازی | |
| إستقلال | سەربەخۆیی | بڕوانە : « مستقل » . |
| استهلاك ( اندثار الشیء ) | پوان | بەرامبەر بە « Deteriation » |
| اسطورة | ئەفسانە | |
| إسكان ( بناء المساكن ) | خانەسازی | |
| إسكان ( العشائر ) | نیشتەجێ کردن | |
| إشتراكية | سۆشیالیزم | |
| أشعة | تیشك | |
| إصطناعي | دەستکرد | |
| أصل | بنەچە | دەلێن : بە بن و بنەچەیدا چووە خواری ... |
| أطراف ( طرف ) | لا | |

| | | |
|---|---|---|
| إعصار | تۆف | زۆر کۆن و باوە ، دەڵێن : ڕۆژێکی تۆفە ... ؛ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس و مەردۆخ و کوردۆییف بۆ هەمان مەبەست بەکاریان هێناوە T. Wahby ..., P. 149; ) Q. Kurdo ..., L. 765 ; مەردۆخ ، بەرگی ـ١ـ ل ٤٠٩ ) دۆر نییە « طوفان » لەوەوە وەرگیرابێ . |
| اغذية محفوظة | خۆراکی پاراستە | لەسەر وەزنی : خواستە ، دەڵێن ئەو شتە خواستەی منە . |
| إلتواء | پەرچ | |
| إمتداد | درێژە | |
| الأمطار التضاريسية ( الأرتفاعية ) | بارانی هەڵەتان | بەرامبەر « Orographic » . |
| إنتاج | بەرهەم | وەك « Product » . |
| إنتاج(عملية الأنتاج) | بەرهەم هێنان | وانە : To Produce. |
| انجراف | ڕادران | بڕوانە : « جرف » و « منجرف » . |
| انجراف التربة ( بالماء ) | داشۆران | بڕوانە : « مبزل » . |
| إنجهاد | بەستن | |
| إنحصار | پاوان | لە زۆر شوێن باوە ؛ دۆر نییە لە ( پاوەند )ەوە هاتبێ ؛ ( پاوان ) بەو زەوی یا باخ یا ئەو جێگەیە دەوترێ کە بۆ تەنها کەسێك تەرخانە . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ انحصار التبغ | پاوانی توتن | |
| ـ دائرة إنحصار التبغ | کارگێڕی پاوانی توتن | |
| إندفاع | گوڕ | |
| أهل النار | دۆزەهی | کرمانج له بریـی ( دۆزەخ ) دەڵـێـن : دۆزەهـ ؛ خانـی ( دۆزەه )ی بەکار هێناوە . |

## ـ ب ـ

| | | |
|---|---|---|
| بئر النفط | چاڵەنەوت | |
| بارز | زەق | |
| بحث ( تحقيق ) | تۆژینەوە | |
| ـ باحث | تۆژەر | |
| ـ باحث علمي | تۆژەری زانست | |
| ـ البحث الادبي | تۆژینەوەی وێژەیی | |
| ـ البحث العلمي | تۆژینەوەی زانستی | |
| بحر | دەریا | بڕوانە : « محیط » . |
| بحيرة | گۆل | ( گۆل ) لە ناو سۆران و کرمانجدا بەکار دەهێنرێ ؛ حاجی قادری کۆیی لە شیعری خۆیدا بەکاری هێناوە ؛ دەڵێن : گۆلی ورمێ یا گۆلی = |

ـــوان ؛ لەلێك وشەی تر هەیە ؛ ( دەریاچە ) بـچووككراوەی ( دەریا )یە ؛ بڕوانە « بحر ».

| | | |
|---|---|---|
| بدو | بەدو | كورد « بدو »ی نییە ؛ لە زمانە ئەوروپاییەكانیشدا هەمان وشـە بەكار دەهێنن ، ئینگلیز دەڵێن : « Bedwin ». |
| بذر القطن | دانۆكە | |
| بردي | زەل | لە بادینان دەڵێن : دەلاف كە دوور نییە هەر ( زەلكاو ) بێ . |
| برق | بڵاچە | |
| برل | دەڵاندن | بڕوانە : « میزل ». |
| بستاني | باخەوان | |
| بطالة | بێكاری | |
| بلاشك | بێ سۆ | وانـە : بێ گومان ؛ لە زۆر ناوچە ( سۆ ) بە مانای ( گومان ) دێ . |
| بناء | بەنا | |

## - ت -

| | | |
|---|---|---|
| تابوت | دارەمەیت | |
| تآكل | داخوران | داخورا ، دادەخورێ ... |
| التجارة الحرة | بازرگانیی ئازاد | بڕوانە : « تاجر » و « تجارة » ( ل ـ ١ ـ ). |

| | | |
|---|---|---|
| التجارة المقيدة | بازرگانی گیرۆ | بڕوانە : « تاجر » و « تجارة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| تجربة | تاقی کردنەوە | |
| تجمع ( کمصدر ) | ئاپۆرەدان | لە موکریان بەکار دەهێنرێ ؛ دەڵێن : خەڵکی ئاپۆرەیان داوە ، ئاپۆرەی خەڵك هات ... |
| ـ التجمع (الجماعة المتجمعة) | ئاپۆرە | |
| تجميل | خەملاندن | لە ناو کرمانج و سۆراندا باوە ، دەڵێن : ئەو مێرگە لە گوڵان خەملیوە ، گوڵ و گوڵزار بەسەر یەکدا خەملیون . |
| تحديد | دیارکردن | |
| تدجين | کەوی کردن | |
| تراجع عن الخطأ ( ندم ) | پەشیمانی | |
| تزحلق | خلیسکان | بڕوانە : « لعبة التزحلق » و « محل التزحلق » . |
| تسمم | ژەهرداوی | لەسەر وەزنی « دەرمانداوی » کە لە زۆر شوێن بەو کەسە دەگوترێ کە « تسمم »ی کردووە ؛ بڕوانە : « سم » و « مسموم » . |
| تسويق | بازاڕکاری | |

| | | |
|---|---|---|
| تشبع | مشت بوّن | ( مشت‌بوّن ) بۆ « كبل » به‌كار ده‌هێنرێ ، لێره‌دا ماناكه‌ی فراوان كراوه ؛ ده‌توانین بڵێین : مشت بووه ، مشت ده‌بێ ... |
| تصدی | به‌ره‌نگاری | |
| التضاريس الارضية | كه‌ندوله‌ند | له زۆر ناوچه بۆ هه‌مان مه‌به‌ست به‌كار ده‌هێنرێ . |
| التضحيات | فیداكاری | |
| التضحية بالنفس | خۆبه‌خت كردن | |
| تعامل | سه‌ودا | |
| تعرية | روَتاندن | ده‌ڵێن : زه‌ویه‌كی روّته‌نه ، واته دار و دره‌خت یا گیای تێدا نییه ، ( داری روّتاو )یش هه‌یه ؛ بڕوانه : « ارض جرداء » . |
| ـ عملية التعرية | روَتاندنه‌وه | |
| تعليب | قوتوبه‌ندێ | بڕوانه : « علبة » و « معلبات » . |
| تعويض | باتی | ده‌گوترێ : له باتی ؛ باتی له ( بژاردن ) باشتره چونكه بۆ هه‌موو جۆره‌كانی « تعويض » ده‌ست ده‌دا ، بڕوانه ( ل - ١ - ). |
| تفتت | پروان | |
| ـ تفتيت | پرواندن | |
| تقسيم (الاموال) | به‌شینه‌وه | |
| تكاثر | زاووزێ | |

| | | |
|---|---|---|
| تكرير | پارزن | مامۆستا کوردۆیێف بۆ هەمان مەبەست بەکاری هێناوە ( Q. Kurdo..., L. 589 )؛ بڕوانە : « مصفاة » ( ل ـ١ـ ). |
| ـ إعادة تكرير | پارزنەوە . | |
| تل | گرد | لە بادینان دەڵێن : گر ؛ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بۆهەمان واتا بەکاریان هێناوە ( T. wahby ..., P. 168 )؛ ( زۆرگی دێدەوان ) ناوچەیەکە زنجیرەیە گردی تێدایە کەوتۆتە نێوان کۆیە و پردی هەولێرەوە . |
| ـ سلسلة تلال | زۆرگ | |
| تلقيح ( عملية التلقيح ) | پەیوەندکردن | لە لادێ دەڵێن : ئەو دارە پەیوەندە . |
| تلقيح مصطلح طبي | کوتان | |
| تمثال | کۆتەڵ ، پەیکەر | لە زۆر ناوچە گەورەپیاو کە دەمرێ کۆتەڵی بۆ دەکەن و بەرلی خاوەنەکەی دەکەنە بەر . |
| تموج | گەوە | بڕوانە : « متموج » . |
| تنقيح | بژار | دەتوانین بڵێین : بژاری تونن . |

| | | |
|---|---|---|
| توازن | هەمبەری | لە ناو کرمانجدا بەکار دەهێنرێ؛ هەمبەری تۆم وانە بەرامبەر بە تۆم ؛ لە هەندێك ناوچە (هامبەر) بەکار دەهێنن ؛ بڕوانە : « متوازن » . |
| ـ التوازن الدولی | هەمبەری دوڵەتان | |
| توازن (توازن الثقل) | هاوسەنگ | |
| توازن ( توازن القوی کمصطلح علمی ) | هاوتین | |
| توجیه | ئاراستن | « وجه » - ئاراستن ، « یوجه » - رەئارێزێ . |
| ـ سنة التوجیه | ساڵی ئاراستن | بڕوانە ( ل - ۱ - ) . |
| ـ السنة التوجیهیة | ساڵی ئاراستەیی | ( بڕوانە ل - ۱ - ) . |
| توزیع | دابەشین | |
| توفیق | رێکخستن ، پێکهێنان | |
| تیار | پێل | مامۆستا کوردۆییێف بۆ هەمان مەبەست بەکاری هێناوە ؛( Q. Kurdo..., L. 607 ) ( شەپۆل ) لە ( شاپێل )ەوە هاتووە کە مانای پێلی گەورەیە ؛ بڕوانە « موج » . |

ـ التيار البحري     پێلی دەریا

ـ التيار التصاعدي   پێلی بەرەژوور

ـ التيـار النازل     پێلی بەرەژێر

## ـ ث ـ

| | | |
|---|---|---|
| ثقل | کێش | بڕوانه : « الوزن » . |
| ثلج | بەفر | |
| ثمرة | بەر | |

## ـ ج ـ

| | | |
|---|---|---|
| جاری | رەوان | |
| جاسـوس | دەســکێز | دز ( دەسکێز )یان هەیە کە ئەو کەسەیە دەچێ ئەو ماڵەی یەکەمیان نیـازی بڕینیـەتی بۆی تـاقی دەکاتەوە و رێگەی بۆ دادەنێ . |
| جانـب | لا ، تەنیشت | |
| جبال إنكسـارية | شاخی گـەوەدار | لە زۆر ناوچەی کوردستان بە بێجاوێچی ناو شاخان دەگوترێ : گەوە ؛ بڕوانه : « تموج » و « متموج » . |
| جثــة | تەرم | |

| | | |
|---|---|---|
| جرف | رادان | |
| ـ انجراف | رادران | |
| ـ منجرف | رادراو | |
| جرىء | ئازا | بڕوانه : « شجاع » . |
| جزء | پاژ | له ئەردەلان بەکار دەهێنرێ ؛ بڕوانە : مەردۆخ ، بەرگی ـ ١ ـ ، ل ٢٥٠ . |
| جغرافيا | جوگرافیا | وشەیەکی لاتینییەو له زمانانی تردا وەك خۆی بەکار دەهێنرێ . |
| جليد | شەختە | |
| جيولوجيا | زەویناسی | |
| ـ جيولوجي | زەویناس | |

## - ح -

| | | |
|---|---|---|
| الحانوت التعاوني | دوکانی هەرەوەزی | بڕوانە : « حانوت » ( ل ـ١ـ ) . |
| حبوب | دەغڵودان | بڕوانە : « الحنطة والشعير » . |
| الحرب الباردة | شەڕی سارد | له زمانه ئەوروپاییەکانیشدا هەر وای پێ دەڵێن : بە ئینگلیزی ( Cold War ) و بە ئەڵمانی ( der Kalte Krieg )ی پێ دەڵێن و بە رووسیش هەر ( شەڕی سارد )ی پێ دەڵێن . |

| | | |
|---|---|---|
| حرب السبعين | شەڕی حەفتایە | |
| الحرب الصليبية | شەڕی خاچ پەرستان | |
| حرش (أحراش) | دەوەن | |
| حرفة | پیشە | |
| ـ حرفی | پیشەگەر | |
| حرية | ئازادی | |
| حزب الأحرار | پـارتی لیبرالی ، پارتی ئازاد | |
| حظ | بەخت | |
| حظيرة (للحيوانات ، داخلية) | غەڵ | |
| حظيرة (للحيوانات ، مكشوفة) | پەچە | |
| حقل النفط | نەوتەڵان | لەسەر وەزنی : ( کەندەلاّن ) و ( بەردەلاّن ) ... |
| حكومة الأدارة | میری کارگێڕی | بڕوانە : « ادارة » و « حكومة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| حكومة المؤتمر الوطني | میری کۆنگرەی نیشتمانی | بڕوانە : « حكومة » ( ل ـ ١ ) . |
| حل | چار | |
| حلقة وصل | بەندەك | |

| | | |
|---|---|---|
| حلول إسلامية | چارى ملدان | بڕوانه : « حل » و « استسلام ». |
| حلويات | شيرينتى | |
| حماية | پاراستن | |
| حمولة | بار | |
| الحنطة والشعير | دانهوێڵه | بڕوانه : « حبوب » . |
| حوض | حهوز | |
| حوض السباحة | گۆمى مهله | |
| حوض النهر | ڕێژاو ، دهراو | |
| حياد | بێلايهنى | بڕوانه « محايد » . |
| ـ الحياد الايجابي | بێلايهنى ساز | |
| حيوى | ژيوهر | |
| ـ حيوية | ژيوهرى | |

## - خ -

| | | |
|---|---|---|
| خاصة | تايبهتى | |
| ـ خواص | تايبهتيكان | بڕوانه : « خاصة » ( ل - ١ - ) . |
| خباز ( نبات ) | تۆڵهكه | |
| خردل | خهرتهله | |
| خزان مائي | عهمباراو | |

| | | |
|---|---|---|
| خزان مائي (للسدود) | ئەستێر | |
| خصوبة | پیت | |
| ـ عديم الخصوبة | بێ‌پیت | |
| خطأ | هەڵە | |
| خط | خەت | زۆر باوە ؛ دوور نییە « خط » لە « کەتا »ی پەهلەوییەوە هاتبێ ؛ ( هێڵ ) تەنها بۆ خەتی جووت بەکار دەهێنرێ . |
| خط الأستواء | خەتی کەمەرێ | بڕوانە : « الدائرة الاستوائية »و « مدار » . |
| خَلـْف | شوێنکر | |
| خيط (حريري) | داوی ئاوریشم | |
| خيط (صوفي) | بەن | |
| خيط (قطني) | دەزوو | |
| خيمة | خێوەت | |

## - د -

| | | |
|---|---|---|
| دائرة | جغز | |
| الدائرة الأستوائية (المدار الاستوائي) | جغزی کەمەرێ | بڕوانە : « خط الاستواء » و « مدار » . |
| دار المجانين | شێتخانە | |

| | | |
|---|---|---|
| دنيا الجزاء | قیامەت | بڕوانە : « قيامة » . |
| دواجن | پەڕەوڵ | وەك زاراو ؛ دەڵێن : ئاگات لەو پەڕەوڵە بێ . |
| دوامة ( دوارة ) ، فتالة | گەردەلوول | |
| دين | دین | |

## - ذ -

| | | |
|---|---|---|
| ذيل | کلکە | دەگوترێ : کلکەی ئەو چیایە ؛ لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە . |

## - ر -

| | | |
|---|---|---|
| رابطة | هاوبەندێ | دەتوانین بڵێین : هاوبەندێ زانایان ، وانە « رابطة العلماء » ؛ بڕوانە ( ل - ١ - ) . |
| رافد ( النهر ) | چۆم | بڕوانە : « جدول » ( ل - ١ - ) و « شط » و « نهر » . |
| رخصة | ئیزن | ( ئیزن ) لە دەرفەت کە « مجال » دەگرێتەوە باشترە ؛ بڕوانە ( ل - ١ - ) و « مجال » . |
| رد | ڕەت | بەو جۆرە باوە ، دەڵێن : ڕەتم مەکەرەوە ... |
| رطوبة | شێ | |

| | | |
|---|---|---|
| رعد | گرمه | |
| رعی | لەوەڕ | |
| - مرعی | لەوەڕگە | وانە جێگەی لەوەڕ . |
| ری | ئاودێری | |
| الرياح التجارية | بای کەشتیرانی | |
| رياح خفيفة السرعة | کزەبا | |
| رياح خفيفة السرعة منعشة وغالبا شمالية غربية | نزەبا | |
| الرياح الدائمية | هەمیشەبا | |
| رياح شرقية باردة خفيفة | زاویتە | |
| رياح شرقية باردة شديدة | زریان | |
| رياح شرقية شديدة | رەشەبا | چ لە هاوین و چ لە زستاندا رۆ دەدا . |
| الرياح الشمالية الغربية (السائدة في العراق) | شەماڵ | |
| الرياح ضد التجارية | دژەبای کەشتیرانی | |

| | | |
|---|---|---|
| الرياح العكسية | دژەبا | |
| الرياح العكسية الغربية | دژەبای ڕۆژئاوا | |
| الرياح المحلية | بای ناوچەیتی | |
| الرياح المصحوبة بالمطر | باسریشك | وانە ئەو بایەی سروشکی بەدەمەوەبەو ( سروشك )یش مانای فرمێسکە و گۆڕزاوە بە ( سریشك ) . |
| الرياح الممطرة | نمەبا | |
| الرياح الموسمية | کژەبا | قیاس لەسەر ( رەشەبا ) ؛ بڕوانە : « فصل » . |

## - ز -

| | | |
|---|---|---|
| زراعة ديمية | دێمەکار | دەڵێن : گندۆرەی دێمەکار . |
| زراعة شتوية | کشتی زستانە | |
| زراعة صيفية | شیناورد ، کشتیهاوینە | |
| زراعة مسقية | ئاویژە | وانە زەراعەتی بەراو ؛ لە ( ئاوی‌زێ ) وە وەرگیراوە . |
| زرع | چاندن | بڕوانە : « مزروع » و « وزارة الزراعة » ( ل ـ ١ ـ ) . |

## - س -

| | | |
|---|---|---|
| سحب | ڕاکێشان | وەك زاراوەیەکی ئابووریش ، دەتوانین بڵێین : ڕاکێشانی پارە لە بانك ئاسانە ... |

| | | |
|---|---|---|
| سخی | دەهندە، بەخشندە | |
| سد | بەست ، بەند | |
| سر | راز | |
| سریع الجریان | خوڕ | |
| سم | ژەهر | بڕوانە : « تسمم » . |
| سموم | گزە | |
| سهب ( سهوب ) | دەشتایی | |
| سهل | دەشت | |
| سوق کبیرة | فرۆشگە | وانە جێگەی فرۆشتن . |
| سوق مشترکة | کۆبازێڕ | |
| سیر | رەوت | شێخ رەزا دەڵێ : ماینەکوێت جاران کە دەتگوت رەوتی رەوتی ئاهووە ... ؛ دەتوانین بۆ زۆر شوێن بەکاری بهێنین وەك : رەوتی خوێندن ، رەوتی کار ... |
| ـ سیر الدراسة | رەوتی خوێندن | |
| ـ سیر العمل | رەوتی کار | |

## ـ ش ـ

| | | |
|---|---|---|
| شائع | باو | |
| شاوی | برژێن | بڕوانە « محرق » . |

| | | |
|---|---|---|
| شجاع | ئازا | بڕوانە « جریء » . |
| شجیرة | پنچك | بەرامبەر « Shrub » . |
| شد | کێشانەوە | بەرامبەر « Tension » . |
| ـ شد الحبل | گوریس کێشەکێ | |
| شدید الصعود | رك | لە زۆر ناوچـە باوە ؛ دەڵێن : هەوراز یا شاخێکی رکە ... |
| شریر | شۆڤار | ( شۆڤار ) لە بەیتی کوردیدا زۆر بەکار هاتووە ، دەڵێن : شەیتان و شۆڤاران لێنا گەزێن ... |
| شط | زێ | ( زێ ) لە رووبار گەورەترە ، دەڵێن رووباری رەوانـدز و زێی گەورە ... ؛ وشەیەکی زۆر کۆنە ، دوور نییە لەگەڵ « Sea » دا لە یەك رەگەوە هـاتبن ؛ زەینەفون بەکاری هێناوە ؛ بڕوانە : « جدول » ( ل ـ ١ ـ ) و « رافد » و « نهر » . |
| شلال | سۆلاف | |
| شمعة ( للأضاءة ) | مۆم | |
| شمع ( مادة ) | مێو | |
| شنان ( بنان ) | ئەسپۆن | |
| شهادة آخر راتب | باوەڕنامەی دوامووچە | بڕوانە : « راتب » ( ل ـ١ـ ) . |

## - ص -

| | | |
|---|---|---|
| صاعقة | بروسك | |
| صانع | سازكار | بڕوانه : « صناعة » . |
| صحراء | سارا | مەولەوی زۆر جار بەكاری هێناوه ، دەڵێ : من نه كەربەلای سارای مانەمدا ؛ ( بيابان) فارسيه ( مامۆستا تۆفيق وەهبيش وا دەڵێ ) ؛ دوور نييه « صحراء » له ( سارا )وه هاتبێ . |
| صخر | كەڤر | له كرمانجيدا هەيه ، مەبەست ( بەردی گەورەيه ) . |
| صريفة | زنج | |
| صقيع | خوسار | ( زوقم )يش هەيه ، بەلام ( خوسار ) له ناو كرمانج و سۆراندا باوه . |
| صك الغفران | پسولەی بوردن | |
| صلف | رووقايم | |
| صليب | خاچ | |
| ـ الحرب الصليبية | شەڕی خاچپەرستان | |
| ـ الصليب الاحمر | خاچی سوور | |
| صناعة | سازكاری | بڕوانه : « صانع » . |

## ـ ض ـ

| | | |
|---|---|---|
| ضحل | تەنکاو | |
| ضحية | قوربانی | |
| ضغط | تەوژم | لە لادێ بەکار دەهێنرێ ؛ لە هەندێك ناوچە دەڵێن : تەوژمی خوێنی هەس . |
| ـ ضغط خفيف | تەوژمی سوك | |
| ـ ضغط الدم | تەوژمی خوێن | |
| ـ ضغط عالي | تەوژمی بەرز | |
| ـ ضغط اطيء | تەوژمی نزم | |

## ـ ط ـ

| | | |
|---|---|---|
| طب البيطرة | بەیتاڵی | ( بەیتاڵی ) و ( بەیتاڵخانە ) دەمێکە بەکار دەهێنرێن و لە ناو دەشتەکییەکانیشدا باوە . |
| الطبقة الثالثة | چینی سێیەم | بڕوانە : « طبقة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| الطبقة العامة | چینی رەمەکی | « عامة » بە مانای ( رەمەکی ) ، وانە پێی ( ی ) لێرەدا « نسبة » نییە ؛ بڕوانە : « طبقة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| طبيعة | سروشت | |

| | | |
|---|---|---|
| طبيعي | خۆڕسك | وانە بۆ خۆی دروست بووە و دەستكرد نییە ؛ دەڵێن : ئەو كێوە خۆڕسكە ، گیای خۆڕسك ... |

## ـ ظ ـ

| | | |
|---|---|---|
| ظِهرياً | پشت گوێ خستن | |

## ـ ع ـ

| | | |
|---|---|---|
| عادة ( تعود ) | خو | |
| عادة ( تقليد ) | نەریت | |
| عاصفة | بۆران | |
| عاقول | حوشترالوك | دەبێ لە ( حوشتر ئالیك )ەوە هانبێ . |
| عبور | ڕێبار | |
| عدم استقرار | پشێوی | |
| عديم الحياء | بێشەرم | |
| عرف | داب | |
| عرق سوس | مێكوك | لە ئەردەلان ( بەلەك ) بەكار دەهێنن . |
| عصر | چەرخ | |
| ـ عصر النهضة | چەرخی ڕاپەڕین یا وریابۆنەوە | |

| | | |
|---|---|---|
| عصيان | سەرپێچی | بڕوانە : « تمرد » ( ل ـ١ـ ) . |
| عقائد | بیروباوەڕ | |
| علف ( للدواب ) | ئالیك | |
| علف ( للدواجن ) | چینە | لە ( چنینەوە )وە هاتـووە ؛ لە موکریان باوە ، دەڵـێن : چینەی مریشکەکان بدەن ؛ مەردۆخ بـۆ هەمان مەبەستی داناوە ( بەرگی ـ ١ ـ ، ل٥٩٤ ) . |
| عمداً | ئەنقەست | هەرچەندە لە « عن قصد »ی عەرەبییـەوە هاتووە بەڵام بە تەواوی لە قەوارەی زمانی کوردیدا نواوەتەوە . |
| عمودي | ستوون | بەرامبەر : « Vertical » ؛ لە ناو جافدا دەڵێن ( ستوون ) ؛ ئەستوونیش باوە و تەنانەت لە هەندێك شوێن دەگوتـرێ : ( ئەسـتونگە ) یا ( ئەستووندەکە ) ، واتە ئەستوونی بچووك . |
| عميل ( اقتصاد ) | سەوداگەر | |
| عميل ( سياسي ) | کرێگرتە | |
| العهد الأعظم ( الوثيقة العظمى ، الميثاق الأكبر ) | پەیمانی مەزن | بەرامبەر : « Magna Carta » . |

| | | |
|---|---|---|
| العهد القديم | تەورات | |
| عيب ( اخلاقي ) | شوورەیی | بڕوانه (ل ـ ١ ـ ) . |
| عيب ( نقص ) | خەوش | بڕوانه : (ل ـ ١ ـ ) . |

## - غ -

| | | |
|---|---|---|
| غابة ( اصطناعية ) | چەم | لە هەندێك ناوچە ( بێشە ) بەكار دەهێنن ؛ ( چـەم ) تەنها لە كوردیدا و ( بێشە ) لە فارسیشدا بەكار دەهێنرێ . |
| غابة ( طبيعية ) | لێڕ | گەلێك وشەی تریش هـەر بۆ ئەم مەبەستە لە كوردیدا بەكار دەهێنرێن ؛ « جـەنگەل » لە فارسیشدا هەیە . |
| غابة كثيفة | چڕ | بەكار هێنانی ( چڕ گەن ) بۆ ئەم مەبەستە راست نییە چونكە ( چڕ گەن ) ئەو شوێنە دەگەیێنێ كە گیایەكی زۆری تیدا بێ . |
| غزل | ریس | دەڵێن : ریسەكەم بـۆوە بـە خوری ؛ لە هەندێـك ناوچـە دەڵێن : ڕێس . |
| غني بالمواد الحياتية | بژوێن | |
| غير مثمر (غير أصيل) | زۆڕ ، خرش | لە بادینان ( خرش ) بۆ داری میوە بەكار دەهێنرێ : بڕوانـە : « غير أصيـل » ( ل ـ ١ ـ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| غير مجاز (اقتصادی) | بێپاس | (پاس) وشەیەکی کوردیی بەتیی کۆنە ؛ لە (بـۆ پاس)ەوە وەرگیراوە . |

## - ف -

| | | |
|---|---|---|
| الفحم الحجري | رەژوی بەرد | رەز = رەش ، بە کرمانجیش (رەزی)یە . |
| فرش (مفروشات) | رایەخ | |
| الفروسية | سواری | |
| - نظام الفروسية | سوارکاری | |
| فصيلة (بشرية) | تیرە | تیرە مانای «طائفة»یە ، بەلام دەتوانری بۆ ئەم مەبەستەش بەکار بهێنری . |

## - ق -

| | | |
|---|---|---|
| قدرة | هێز | بەرامبەر «Power» . |
| قراصنة البحر | چەتەی دەریا | |
| قسط | پاژ | |
| قشر | توێکڵ | |
| قصدير | تۆتیا | لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکار دەهێنری . |
| قصيل | فەرسیل | |

| | | |
|---|---|---|
| قطاع | پار | وانه ( بەش ) ؛ پار ـ پارچـە ؛ مامۆستایان نۆفیـق وەهبی و ئەدمۆنس بـۆ هەـن مەبەسـت بەکاریان هێناوه, ... (T. Wahby . P. 102 ) . |
| ـ قطاع خاص | پاری تایبەتی | |
| ـ قطاع عام | پاری گشتی | |
| قطب | تەوەره | له زماره یەکی گۆڤاری کۆڕدا له ئەنجامی هەڵەی چاپدا بووه به ( تەوەر ) ( ل ـ ١ ـ ) . |
| ـ قطبي | تەوەرەیی | |
| القطب المنجمـد الجنوبي | تەوەرەی بەستەڵەکی باشـوور | بڕوانه : « جنوب » و « قطب » ( ل ـ١ـ ) و « منجمد » . |
| القطب المنجمـد الشـمالي | تەوەرەی بەستەڵەکی باکوور | بڕوانـه : « شمال » و « قطب » ( ل ـ١ـ ) و « منجمد » . |
| قطيع | ران | |
| ـ قطيع الماشية | گاڕان | |
| القلع باليد (للنبات) | دەسکەنه کردن | دەڵێن : دەغڵی دەسکەنه ... |
| قلم الحسابات | بەشی دەفتەرداری | بڕوانه : « محاسب » و « محاسبة » ( ل ـ١ـ ) . |
| قماش | کوتاڵ | |
| قمة | ترۆپ | دەڵێن : سـەرترۆپی چیـا ؛ له هـەندێك شوێن ( ترۆپك )یش بەکار دەهێنرێ . |

| | | |
|---|---|---|
| فوت | بزێو | |
| قیاس | پێوان | بۆ « حجم » و « طـول » و « مساحة » و « وزن » ؛ بڕوانه : « مساحة » . |
| قیامة | قیامەت | بڕوانه : « دنیا الجزاء » . |

## ـ ك ـ

| | | |
|---|---|---|
| كاهن | پێشبین | « كاهن » له « كهانة » و « تكهن »ەوه وەرگیراوه ، عەرەب زۆ دەچوّن بۆ لای « كاهن » بۆ « تكهن » ... |
| كبس | پەستاوتن | دەتوانین بڵێین : پەستاونی توتن یا خورما ... |
| كبش | بەران | |
| كثير الناتج | بەبڕشت | زاراوێکی باوه ، له زۆر شوێن دەڵێن : زەویيەکی بەبڕشته ... |
| كماليات | فەنتازی | |
| كمرك | گومرك | |
| ـ حماية كمركية | پاراستنی گومرگی | بڕوانه : « حماية » . |
| كنتورات (مصطلح جغرافي) | کەوەڕ | دەڵێن : کەوەڕ له قەراغ لوّم و شاخدا هەیه ، له بن کەوەڕەکەدا ... |
| الكواكب السيارة | ئەستێره گەڕۆکەکان | |

| | | |
|---|---|---|
| كوخ | كوخ | دوور نييه كوردى يا فارسى بێ ؛ س فار بـه « قصـر » دەلێن « كاخ » و لەوانەيە ( كوخ ) « تصغير »ى بێ . |

## — ل —

| | | |
|---|---|---|
| لحظة | تروكه | بڕوانه : « لحظة » ( ل ـ١ـ ) ؛ دەگوترێ : تروكەى چـاو ، بە تروكەيەك ... |
| لعبة التزحلق | خليسكێن | بەرامبەر « Skiing » ؛ لەسەر وەزنى : مۆشێن ، ميچێن ... ؛ بڕوانه : « تزحلق » و « محل التزحلق » . |

## — م —

| | | |
|---|---|---|
| مالك الارض | زەويدار | بڕاونه : « الملكية الزراعية » . |
| مبادرة | پێش دەستى | له ( پێش دەستى )يەوە وەرگيراوە . |
| مبزل | داچۆڕگه | له كتێبى فێرگەكاندا ( داشۆڕگه ) بەكار هێنراوە ( پەروەردە وزانست ، ل ١٥٠ ) ، بەلام ( داشۆڕگه ) يا (داشۆران ) بۆ « تعرية » و « انجراف التربة » زياتر دەست دەدا ، دەلێن : ئەو خاكە شۆڕەكە ؛ مامۆستا قەنانى كوردۆش (شۆڕ)ى بەكار هێناوە= |

| | | |
|---|---|---|
| | | ( Q. Kurdo ..., L. 718 ) = ؛ داچۆڕان ئەو ئاوە زیادەیە کە دەچۆڕێتە خوارێ ؛ ( دەلاّو )یش بۆ هەمان مەبەست دەست دەدا ؛ بڕوانە : « بزل » . |
| مبيعات | فرۆتەنی | |
| المتجول في العالم | جیهانگەڕ | وانە : جیهان گەڕ ؛ وەك : مالاّنگەڕ ، شەوگەڕ ... |
| متحيز | لایەنگر | بڕوانە : « منزوي » . |
| متضائق | تەنگاو | ( تەنگەتاو )یش بەکار دەهێنرێ . |
| متطرف | سەرچڵ ، سەرەڕۆ | |
| متقطع ( للشيء ) | پسۆك | قیاس لەسەر : کرینۆك ، خەفۆك ... ؛ لە ( پسان )ەوە وەرگیراوە ؛ لە هەندێك ناوچە بەکار دەهێنرێ . |
| متموج | گەوەك | لەسەر وەزنی رووەك ؛ دەتوانین بڵێین : خاکێکی گەوەکە ؛ لە موکریان بە سەربەرەوژێر و سەربەرەوژوری لەسەر خۆ دەڵێن ( گەوە ) ؛ بڕوانە : « تموج » و « جبال إنكسارية » . |
| ـ الاراضي المتموجة | خاکی گەوەك | |

| | | |
|---|---|---|
| متوازي | هەمبەر | بڕوانە : « توازن » . |
| مثمر | بەردار | |
| مجال | دەرفەت | دەڵێن : دەرفەتی ئەدام دوو قسە بکەم ؛ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بۆ هەمان مەبەست بەکاریان هێناوە ,.. T. Wahby ) P. 35 ) |
| مجرى (المياه القذرة او الامطار) | ئۆهێن | |
| مجلس الامن | ئەنجومەنی ئاسایش | بڕوانە : « مجلس » ( ل ــ ١ ــ ) . |
| مجلس الوصاية | ئەنجومەنی پێسپێری | |
| المجلس الوطني | ئەنجومەنی نیشتمانی | |
| محاصيل صيفية | شێناورد | لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکار دەهێنرێ ؛ ( ئەزەکاڵ ) بەوە دەگوترێ کە دوای پەڵە دەچێنرێ . |
| محايد | بێلایەن | بڕوانە : « حياد » . |
| محتاج | ئاتاج | |
| محدود | رادەدار | بڕوانە : « حد » ( ل ــ ١ ــ ) . |
| محرق | سوتێن | بڕوانە : « شاوی » . |
| محرك | بزوێن | دەتوانین بڵێین : هێزی بزوێن یا هێزە بزوێنەکان ، واتە : ( القوة ــ يان ــ القوى للحركة ) . |
| محظوظ | بەختەوەر | |

| | | |
|---|---|---|
| محل التزحلق | خلیسکه | بڕوانه : « تزحلق » و « لعبة التزحلق » . |
| محل التنزیز | زەنەك | |
| محلي | خۆجێیتی | لە هەندێك ناوچه بەکار دەهێنرێ . |
| محیط | زەریا | بڕوانه : « بحر » . |
| مخروط | قوچەك | لە هەندێك ناوچەی کوردستان بە ئەنگوستیلەی درومان دەڵێن : قوچەکه . |
| ـ مخروط ناقص | قوچەکی کەل | |
| ـ مخروطي | قوچەکی | |
| مخصصات المبیت | شەوانه | |
| مخفی | نهێنی | به فارسی ( نهانی ) به . |
| مـــد | خێزاو | |
| مدار (مصطلح جغرافي وفلکي) | کەمەره | |
| ـ مدار الجدي | کەمەرەی کار | کار = کارژۆڵه . |
| ـ مدار السرطان | کەمەرەی قرژاڵ | |
| مدّرج | پلەك | له ( پلەکان ) ەوه وەرگیراوه که وشەیەکی باوه . |
| مذهب | ئایین | |
| مرتفع | بەرزه | |

| | | |
|---|---|---|
| مرتفعات | هەڵەت | له زۆر ناوچەی بادینان دەڵێن : ئەو شوێنە هەڵە ، واته بەرزە ؛ ( هەڵ ) وەك نیشانەی بەرزی و سەرەوژوور دێ : هەڵدان ، هەڵکردن ، هەڵخستن ؛ بڕوانه : « الامطار التضاريسية » . |
| مرن ( کمصطلح علمي ) | بەپێز ، پێزا | بڕوانه : « هش » . |
| مزروع | چاندراو | بڕوانه : « زرع » . |
| المزروعات الصيفية | شیناورد | |
| مزروع يدويا | دەسچێن | له ( دەست چێن )ەوە وەرگیراوە . |
| المزن | گەواڵە | |
| مساحة | رووپێو | بەرامبەر « Area » . |
| مساحة | پێوان | بەرامبەر « Surveying » ؛ بڕوانه : « قياس » . |
| مساعدة | یارمەتی | |
| مستقر ( وضع ) | کز | دەڵێن : دنیا کزە . |
| مستقل | سەربەخۆ | |
| ـ إستقلال | سەربەخۆیی | |
| مستنقع | زەلکاو | له زۆر ناوچەی کوردستان بەو شوێنەی ئاوی تێدا دەوەستێ و زەلی تێدا دەڕوێ دەڵێن : زەلکاو . |

| المسطحات المائية | تەختاوەکان | لە (تەخت) و (ئاو)ەوە داتاشراوە . |
| --- | --- | --- |
| مسموم | ژەهراوی | بڕوانە : « تسمم » و « سم » . |
| مسيحي | دیان | لە زۆر شوێنی کوردستان بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنرێ . |
| مسيل (مجرى النهر) | ئاوەڕۆ | |
| مشارف | هەنداف | لە بادینان باوە ، دەڵێن : هەندافی گوندێ ... |
| مشتى | گەرمەسێر | مەولەوی دەڵێ : گەرمەسێر دڵ سیاساڵێشەن ؛ لە هەندێك ناوچە دەڵێن : گەرمەسێر . |
| المشرق العربي | عەرەبستانی ڕۆژهەڵات | بڕوانە : « المغرب العربي » . |
| مصب | ڕێژگە | |
| مصفى ( مكان التصفية ) | پاڵێوگە | بڕوانە : « مصفاة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| مصير | چارەنوس | |
| مصيف | زۆزان | |
| مضاعفات | درژانگ | لە کتێبی فێرگەکانیشدا بەکار هێنراوە ( پەروەردە و زانست ، ل ١٥٠ ) ؛ قیاس لەسەر : برزانگ ،قرزانگ .. |
| مضيق بين جبلين أو تلين | دەربەند | |

| | | |
|---|---|---|
| مضيق ( مطلق المضيق ) | تەنگژە | وشەیەکی کوردی بەنییە و لە زۆر شوێن بەکار دەهێنرێ . |
| مطر شديد قصير الأمد | ڕێژنە | دەگوترێ : ڕێژنە باران . |
| مطر شديد ومتواصل | ڕەهێڵ | لە هەندێك شوێن دەگوترێ : ڕەهێڵە . |
| مظهر | ڕواڵەت | |
| معدن | کان | |
| ـ معدني | کانی | بڕوانە : « المياه المعدنية » . |
| معلبات | قوتوبەند | بڕوانە : «تعليب» و «علبة» . |
| معمار ( معماري ) | ئارکتێکت ، ڕەنگرێژ | بەرامبەر « Architect » . |
| المغرب العربي | عەرەبستانی ڕۆژئاوا | بڕوانە : « المشرق العربي » . |
| مفاهيم ( مفهوم ) | چەمك ، چمك | بڕوانە : فەرهەنگی مەردۆخ ، بەرگی ـ١ـ ، ل ٥٧٤ ؛ فەرهەنگی خاڵ ، بەرگی ـ ٢ ـ ، ل ٤٠ . |
| مقاومة | تابشت | لە لادێ دەڵێن : من تابشتی ئەو کارەم نییە ؛ دەتوانین بڵێین : تابشتم نییە . |
| مقطع | بڕگە | |
| مقوم ( مقومات ) | بنەما | |

| | | |
|---|---|---|
| مقياس | پێودان | بەرامبەر « Standard » ؛ لە لادێ باوە . |
| ملاحة ( بحرية ) | دەریاوانی | |
| ملتقى النهرين | دۆ ئاوان | بەو ناوچەیەی تانجەرۆ و زەڵم تێیدا بە یەك دەگەن دەڵێن : دۆئاوان ؛ بڕوانە : « ملتقى واديين » . |
| ملتقى واديين | دۆ شیوان | لە هەندێك ناوچە بەكار دەهێنرێ ؛ بڕوانە : « ملتقى النهرين » . |
| الملكية الزراعية | زەویداری | بڕوانە : « مالك الارض » . |
| ملوحة | سوێری | |
| مملكة | شانشین | بەرامبەر « Kingdom » . |
| مناخ | ئاووهەوا | |
| ـ المناخ الدافيء | ئاووهەوای گەرمۆك | |
| ـ المناخ الصحراوي | ئاووهەوای بیابانی | |
| ـ المناخ المعتدل | ئاووهەوای فێنك | |
| منتج | بەرهەمدار ، بەرهەمهێن | |
| منجرف | رادراو | بڕوانە : « انجراف » و « جرف » . |
| منجمد | بەستەڵەك | |
| منحدر | لێژ | |

| | | |
|---|---|---|
| منخفض | نەور | لە هەندێك ناوچەی کوردستان بەکار دەهێنرێ . |
| منزعج | جاڕز | بڕوانە : « ازعاج » . |
| المنزه عن العيوب | بێخەوش | |
| منزوي (منعزل) | کەنارگیر | بڕوانە : « متحيز » . |
| المنطقه الأستوائية | ناوچەی کەمەرێ | |
| المنطقة المعتدلة الجنوبية | ناوچەی هێدێ باشوور | |
| المنطقة المعتدلة الشمالية | ناوچەی هێدێ باکوور | |
| المنطقة المنجمدة | ناوچەی بەستەڵەك | |
| منظر | دیمەن | |
| منظم | ڕێکخەر | |
| منظم حروف | پیتکار | |
| مهاترة | شەڕەقسە | |
| مهني | پیشەیی | بڕوانە : « مهنة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| مواساة | دڵدانەوە | ( دڵنەوایی )ش بەکار دەهێنرێ . |
| موج | شەپۆل | وانە ( شابێل ) ـ بێلیگەورە ؛ بڕوانە : « تيار » . |
| موزع | نامەبەر | |
| موسم الأنجماد | سەهۆڵ بەندان | |

| | | |
|---|---|---|
| مياه جوفية | ژێراو | له ( ژێر ئاو )ەوە وەرگیراوە . |
| المياه الغازية | گازاو | |
| مياه معدنية | کاناو ، گەڕاو | مامۆستایان تـۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس بۆ هەمان مەبەست بەکاریان هێناوە (T.Wahby,... P. 71)؛ له خـورماڵ و باتیخێلانن بەو ئاوە دەڵێن ( گەڕاو ) . |
| مياه النزيز | زناو | |
| ميزانية | بوجە | له ( بودجە )وە وەرگیراوە . |
| ـ الميزانية السنوية | بوجەی ساڵانە | |

## ـ ن ـ

| | | |
|---|---|---|
| ناظم (للري) | بناوان | |
| نبات | رووەك | |
| ـ نباتات بصلية | پیازەکێ | |
| ـ نباتات بقولية | رووەکی کلوودار | ( کلو ) ئەو بەرگەیە کە چەند دەنکە باقلە یا فاسۆلیا یا ئەو جۆرە بەرهەمانەی تێدایە . |
| ـ نبات طحلبية | رووەکی قەوزەیی | « طحلب » قەوزەیە . |
| نثر البذور | تۆودان ، تۆوەشاندن | له موکریان دەڵێن : تۆدان . |
| نزع السلاح | چەك کردن | |

| | | |
|---|---|---|
| نزيز | زۆنگ | (زۆنگ) بەو شوێنە دەگوترێ کە ئاوێکی کەمی تێدایە و زەویەکەی شلە و لەوانەیە خەڵکی تێدا نقوم بێ . |
| نسب | ڕەچەڵەك | |
| نسج | تەون | « انسج » = دەتەنم ... |
| ـ نسيج | تەون | |
| نسيم | سروە ، شنە | |
| نظام الأدارة | پێڕەوی کارگێڕی | بڕوانە : « ادارة » و « نظام » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| نظام الاداره (مصلح تأريخي) | ڕژێمی کارگێڕی | |
| نظرية | تیۆری | وشەیەکی کۆنە و نە ڕێگەی لاتینییەوە تێکەڵی گەلێك زمانی ئاری بووە ؛ لە کوردستانی ئێران دەمێکە ( تیئۆری ) بەکار دەهێنن ، بەڵام ( تیۆری ) لەسەر زمان سوکترە . |
| ـ نظرية الحق الالهي | تیۆری مافی خودایی | دەتوانین بڵێین ( خوایی ) . |
| ـ نظرية العقد الاجتماعي | تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی | |
| نهج | ڕچە | بڕوانە : « اسلوب » ( ل ـ ١ ـ ). |

| | | |
|---|---|---|
| نهر | روبار ، چۆم | بڕوانە : « جدول » ( ل ـ ١ ـ )و « رافد » و « شط » . |

## ـ هـ ـ

| | | |
|---|---|---|
| هادیء | ئارام | |
| ـ المحیط الهادیء | زەریای ئارام | بڕوانە : « محیط » . |
| هش | بۆپیز | بەرامبەر « Brittle » ؛ بڕوانە : « مرن » . |
| هضبة | بان ، بانـو | لەولای سەقـزەوە « هضبە »ی مۆبەتو هەیە کە ٣٠٠ گوندێکی تێدایە و پێی دەڵێن ( بان مۆبەتو ) ؛ دوور نیە ( بانە )ش هەر لەوەوە هاتبێ ... |
| هوایـة | خولیا | |
| هور | قۆپی | دوور نییە « هور » لە ( خوز )ی کوردی و فارسـییەوە هاتبێ ؛ قۆپی ئەو نزمایییە کە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە و قامیش و سۆسۆ و ئەو جۆرە رووەکانەی تیا دەڕوێ ؛ مامۆسـتایان تۆفیـق وەهبی و ئەدمۆنس بۆ هەمان مەبەست بەکاریان هێناوە( T.wahby...,P.117) ؛ لە کوردستانی ئێران قۆپێ باڵ باڵی و لە کوردسـتانی عـیراق قۆپێ قەرەداغ هەیە . |

## - و -

| | | |
|---|---|---|
| وادی | دۆڵ ، گەلی | بەرامبەر : «Valley» ؛ (شیو) یش بۆ «وادی» بجۆرێ بەکار دەهێنرێ .. |
| وادی (صغیر) | شیو | |
| واسع | فرەوان | |
| وحدة (توحد) | یەکێتی | بڕوانە : « اتحاد » . |
| وراء الظهر | پاشملە | |
| وزارة النقل | وەزارەتی گواستنەوە | « Transportation » ؛ بڕوانە : « وزارة » ( ل ـ ١ ـ ) . |
| وزن | کێشان | بڕوانە : « ثقل » . |
| وعظ | پەند | |
| ـ واعظ | پەندیار | |
| ولایة | ئاستان | |
| ولي | پیر | |

* * * * * *

